# ژمانی هەیزەران

وتارێک لەبارەی گەنج و قوتابیانەوە

د. فەرهاد پیرباڵ

## ئاگاداركردنەوەیەكی فەرمی

**هەر قوتابیو گەنجێك، كوڕ یان كچ،**
**ئەگەر تەمەنی لە ١٨ ساڵ كەمتر بێت،**
**نابێ ئەم كتێبە بخوێنێتەوە!**


* ناوی نووسەر: فەرهاد پیرباڵ
* كتێب: زمانی حەیزەران، وتارێك لەبارەی گەنجو قوتابییانەوە
* تایپو نەخشەسازی: ماڵی شەرەفخانی بەدلیسی
* ئەرشیف: رۆژنامەی (خوێندنی لیبراڵ)
* چاپو بڵاوكردنەوەی: چاپخانەی رەنج
* تیراژ: (٣٠٠٠)دانە.
* سلێمانی: ٢٠٠٦
* ژمارەی سپاردنی (٣٢)ی ساڵی ٢٠٠٦ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە



* نرخ: تەنها سێ هەزارو پێنج سەد دینارە



نووسەر بە قەڵەمی ئەردەشێری ڕۆستەمی

من بەجەسارەتەوە گۆشەنیگای خۆم دەردەبڕم. چونکە، بیر، پێش هەموو شتێک، گۆشەنیگایەکی شەخسییە و سروشتێکی تاکەکەسییانەی هەیە. ڕای من نابێتە پێوەر بۆ شتەکان، تەنیا وەک پێوەرێکی بینینی تایبەتی من بۆ شتەکان حسێبی بۆ دەکرێت. من ئەوەندەم بەسە بۆ پێشکەشکردنی مەعریفەیەک، پێشبینیی خۆم وێنا بکەم. هەر لەڕێگەی ئەمەشەوە پێشبینییەک - لەبارەی شتەکانەوە نا - لەبارەی خۆم دەردەبڕم..

**مۆنتاین** Montagne

فەیلەسووفی فەرەنسیی ڕێنسانس



خوێندکارنی زانکۆی سلێمانی لەکاتی ئەگەری لەشکرکێشیی تورکیا بۆ ناو کوردستانی عیراق

# کولتووری ڕاستەقینە دژی کولتوورە..

پاسکال

بەئاشکرا دەڵێم: ئەم کتێبە لەپێناو ئەوە دەنووسم کە - بتوانم هیچ نەبێ بۆ خۆمی بسەلمێنم - پێویستە لەمەودووا لەجیاتی پیر و کۆن و کەنەفتەکان گەنج و نەوجەوان و لاو، لەجیاتی مامۆستا و دکتۆر و پرۆفیسۆرەکانیش قوتابی و خوێندکار و فێرخوازازەکان بکرێن بە مەرجەع!

دەمەوێ وزە و متمانەیەکی ئەوتۆ لەناو دەروونیاندا بروێنم کە بەڕاستی بگەنە ئەو هێزەی بزانن چۆن فێربن بتوانن لەجیاتی جانتا دەسەڵات بگرنە دەست؛ لەجیاتی مۆبایل و سیدییە ڕۆمانتیک یان خیلاعییەکان پەساپۆرتێک بۆ دنیاگەڕان و دنیا دیتن بخەنە باخەڵی خۆیانەوە؛ لەجیاتی دەرگا قفڵدراوەکانی ماڵ یان بەشە ناوخۆییەکانیش چەند ڕێگایەکی خەونییان هەبێت !

بەکورتی، لەپێناو بێدارکردنەوەی هەستێکی دوژمنکارانە بۆ سەر واقیع، بۆ سەر پیرە سەر ڕووتاوە و مودەڕەڕەعەکان ئەم کتێبە دەنووسم؛ لەپێناو هەڵگیرساندنی ئاژاوەیەکی بەردار ئەم کتێبە دەنووسم..

لە ئێستاشەوە دەڵێم: هەموو سیاسەتمەدار و هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی حزبە فەرمانڕەواکانی کوردستان پێویستە ئەم کتێبەی من بخوێننەوە، بۆئەوەی دوواتر گازاندە لە گەنج و تەڵەبەی ئازادیخوازی تووڕەی ئەمڕۆ نەکەن ئەگەر بەیانییەکی زوو لەناکاو لەخەو هەستان و دیتیان میللەت، بە سەرکردایەتیی ئاڵای ڕەشی گەنج و خوێندکارانەوە، هەڵیانکوتاوەتە سەر بارەگا و وەزارەت و زانکۆ و دامودەزگاکانیان..

# ئیسماعیل پێغەمبەر

کێشەی قوتابی و گەنج لە هەموو زەمان و شوێنێکدا ڕاستەوخۆ لە چوارچێوەی بیری زۆرانبازیی نەسلەکاندا Conflit des Generations خۆی دەدۆزێتەوە. کەواتە جێگەی خۆیەتی لە سەرەتادا بەم پرسیارە دەست پێ بکەین:

ئایا هیچ دیاردەیەک یان ئاماژەیەک لە سەدەکانی ڕابردووی کوردستاندا هەن بۆئەوەی ئێمە بتوانین بزانین: ئاخۆ لەنێو ڕابردووە دوورەکانی ئێمەدا ململانێی نێوان نەسلەکان هەبووە یان نا؟

ململانێی نەوەکان Conflit des Generations خاسیەتێکی تایبەتمەندی کوردستان نیە؛ دیاردەیەک نیە تەنێ لەناو ئێمەدا یان تەنێ لەدووای ڕاپەڕین و ڕووخانی ڕژێمی سەدامەوە ڕووی لە ئێمە کردبێت، بەڵکو خاسیەتێکی هەمەلایەنە: لە کۆنەوە و لەناو هەموو میللەتێکدا هەبووە و هەیە. لەنێو ئەفسانەکانی هەموو نەتەوەیەکدا، نەمازە لەنێو هەموو کتێبە ئاسمانییەکانیشدا (بە حوکمی ئەوەی دین پێش هەموو فەلسەفە و ڕووناکبیرییەک ویستوویەتی لە ژیان تێ بگات و واقیع ڕێک بخات و کۆمەڵ و ئینسان بخاتە چوارچێوەیەکی ڕێکوپێکەوە) باسی لێکراوە. بەگوێرەی سەردەمی نوێشەوە، من واتێدەگەم هەرای ڕۆمانسییەکان دژی کلاسییزم، شەڕ و شۆڕەکانی سوریالیزم دژی ڕۆمانسی و ڕیالیستەکان، هەرای ئانارشیستەکان یان جەنگی مۆدێرنیست و پۆست مۆدێرنیستەکان دژی کۆنەخوازەکان، شەڕی ڤۆڵتێر و مارتن لۆسەر دژی کەنیسە، شەڕی باکۆنین دژی دەوڵەت، شەڕی نیتشە و سپینووزا و ئەلبێرت کامۆ.. هەموو ئەمانە لە چوارچێوەی ئەم جەنگەی نەسلەکاندا خۆیان دەدۆزنەوە و لەکۆتاییدا هەموو ئەم شەڕانە (ئەگەرچی لە ناوەڕۆکدا بیری یاخیگەرانەی ئینسان دەردەخەن دژی دەسەڵات یان لەدژی نەسلی پێش خۆیان، بەڵام) لەپێناو خزمەتکردنی بیری یاخیگەرانەی گەنجانە و خوێندکارانەدا بوورونە؛ بە ڕۆمانەکانی تورژنیف، دی ئێچ لۆرەنس، ییتس، نەجیب مەحفووزیشەوە.

پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەی سەرەوە بدەمەوە، دەمەوێ ڕاستییەک، کە لەبۆ من ڕووناک دەدرەوشێتەوە، بخەمە ڕوو لەبارەی ئەو جیاوازییەی لە دیدی ئینسانی کورددا هەیە لەچاو دیدی ئینسانی ئەوروپایی لە بەستێنی جیهانبینیی هەردوولایان بۆ ئەم شەڕەی لەنێوان نەسلەکاندا هەیە. ناوەڕۆکی ئەم جیاوازیی دیدەش دیارە هی ئەمڕۆ نیە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کانگا قووڵەی لەناو «بێ ئاگایی دەستەجەمعیی» لە دەروونی هەردووکیاندا هەیە، ئەو کانگایەی کە دەروونناسەکان ناوی دەنێن لاشعووری جەمعی Conscience Collective .

دەمەوێ ئاشکراتر بدوێم: ئەم جەنگەی نێوان نەسلەکان (بۆ نموونە لەنێوان باوک و کوڕ) دەنێو کولتووری هەر یەکێک لەم دوو لاشعوورە جەمعییەی ئەورووپا و کورد، هەر لە کۆنەوە، بەجیا خۆی مت داوە: لای هەر یەکێکیان، هەر لە کۆنەوە، بەشێوەیەکی جیاواز لەچاو ئەوەی دیکە خۆی دەربڕیوە و دەردەبڕێ.

من لە کتێبی (چەند نامەیەکی فەرەنسی)شدا گوتوومە و دەیڵێمەوە:

لە کولتووری ڕۆژئاوادا زۆرانبازیی نێوان نەسلی کۆن و نەسلی نوێ زۆرانبازییەکی خوێناوی و شەڕەنگێز نیە. بۆ نموونە باوک (ئەگەر باوک وەک سمبوولێک وەربگرین لەم جەنگەدا) باوکی ڕۆژئاوایی هەمیشە بڕیار و مافی بڕیاردان دەبەخشێتە کوڕ - خۆی، واتە کوڕ ئازاد جێ دەهێڵێت؛ کەچی هەمان ئەو زۆرانبازییەی نێوان باوک و کوڕ لە کولتووری ڕۆژهەڵاتنیدا زۆرانبازییەکی خوێناوی و شەڕەنگێزانەیە، لەسەر بنچینەی دکتاتۆریەت و فەرمانڕەوایی باوک دامەزراوە. هەر بۆیەش دەبینین لە زۆرانبازییەکەی ڕۆژهەڵاتدا هەمیشە باوک دەیباتەوە. بۆ نموونە، تۆ تەماشاکە لە ئەفسانە یۆنانییەکەدا، لایۆس پاشای باوکی ئۆدیب، کاتێ دەزانێ ئۆدیبی کوڕی، غەریزە و هەوەسێکی سێکسی بەرامبەر دایکی خۆی پەیدا کردووە، ناچێ ئۆدیبی کوڕی خۆی بکوژێت، بەڵکو هەڵدەستێ نەفیی دەکاتە دورگەیەک و لە دایکی خۆی دووری دەخاتەوە. کەچی لە ئەفسانە

ئێرانیەکەدا، کاتێ ڕۆستەمی باوک پشتی زۆرابی کوڕی خۆی لە عەرد دەدات، دەمودەست - بۆئەوەی بۆ خەڵک نیشانی بدات کە باوک چەند ئازا و فەرمانڕەوایە - قلنجەکەی ڕۆدەچەقێنێتە هەناوی کوڕەکەی خۆی. ئەمە لەکاتێکدا بێشتر زۆرابی کوڕ، لەکاتی پشت لە عەرد دانی باوکی خۆیدا، جەسارەت و دڵی ئەوەی نەهات باوکی خۆی بکوژێت!

بەراوردکردنی ئەم دوو ئەفسانەیە، خاڵە جەوهەرییەکانی جیاوازیی نێوان فەلسەفەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوامان لەبارەی ئەم مەسەلەیەی جەنگی نێوان نەوەکان تێدەگەیەنێت. بە ئاشکرا پێمان دەڵێت: ڕۆژئاوا هی کوڕە، بەڵام ڕۆژهەڵات هی باوکە. چارەنووسی ڕۆژئاوا هەمیشە بەدەست کوڕ (بەدەست جیلی نوێ) بەڕێوە دەچێت، بەڵام چارەنووسی ڕۆژهەڵات هەمیشە لەدەست باوک (لەدەست جیلی کۆندا) دەمێنێتەوە و دەمێنێتەوە تا بۆگەن دەکات.

بەکورتی: لە ململانێی عەقڵی کۆن و عەقڵی نوێدا، لە ململانێی زەوقی کۆن و زەوقی نوێدا، ڕۆژئاوا پێشدەکەوێت و ڕۆژهەڵات هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە.

کەواتە، ئەوەیە ئیتر؛ تاکەکەس «کوڕ» لە ڕۆژهەڵاتدا تا هەتایە لەژێر نێڵی نەسلی کۆندا دەڕزێتەوە: وەک ئیسماعیل پێغەمبەر هەمیشە و تا هەتایە لەژێر ڕەحمەتی چەقۆی باوکی خۆی (ئیبراهیم پێغەمبەر) هەڵدەلەرزێ: مەگەر تەنیا- تەنیا و تەنیا- هێزێکی دەرەوەی واقیع و دەرەوەی ماتێریاڵەکان لە ئاسمانەوە بێت قوتاری بکات!

دووای ئەم قسانەی لەسەرەوەدا کردم و ئەم دوو نموونە سەلمێنەشم بۆ بەڕاستگەڕاندنی قسەکانم هێنایەوە، کەواتە، ئێستا دەتوانم ڕێ بدەمە خۆم بڵێم: بەدرێژایی مێژووی کورد، واپێدەچێ تاکی کورد، ئەگەر کوڕ ئەگەر کچ (کە مەبەستم گەنجی کورد و نەسلی نوێی کوردە) بام ویستبێتی جیاوازیش بیربکاتەوە و هەندێ جار حەزیشی کردبێت خۆی ئازاد بکات و وەدووای کەلکەڵە و هەوەسەکانی خۆی بکەوێت، بەڵام ئەم هەست و حەز و ویستەی هەرگیزاوهەرگیز نەکردۆتە جەنگێک دژی باوک یان دژی نەسلی کۆن یان

دژی عەشیرەتەکەی. نەیزانیوە دەتوانێ بوێرێت ئەمە بکا. خۆ ئەگەر تاک و تەرا وێرابێتیشی یاخی ببێت و وەک قەدەرێکی سەرهەلکرتوو هیچ نەبێ رابکات لەدەست عەشیرەتەکەی (وەک ئەوەی لای سیامەند، بۆ نموونە، دەبینین) ئەوا ئەو یاخیبوونە- ڕاکردنە لەدەست واقیع، هەمیشە ناکام ئەنجامەکەی بریتی بووە لە هەرەس و کۆست: هەرەس و کۆستی تاکەکەس و گەنج لە هەمبەر عەشیرەت و عەقڵی کۆنی پیر! ئەوەتا هونەرمەندی کوردی زەمانە دێرینەکان (ئافەرین بۆیان) زۆر هونەرمەندانە توانیویانە بێن ئەم ڕاستییە مێژووییە بکەنە بنچینەی تراژیدیا لە بەرهەمە هونەرییەکانیاندا، لە بەیت و حەیران و لاوک و داستانەکانیاندا. هەر بۆیەش یەکێک لە دەرسە ئەخلاقییەکانی هونەری کۆن و فۆلکلۆریمان، بریتیە لەوەی پێمان بڵێت:

یاخیبوون،
ڕاکردن لەدەست واقیع،
تەسلیم نەبوونە ڕای باوک و براگەورە و عەشیرەت،
ڕەدووکەوتن،
سەرسپاردنە دەستی عەشق و هەوەسی گەنجانەی خۆت..
هەموو ئەمانە ئەنجامەکەیان بریتیە لە هەرەسهێنان و
تێکشکان!
دەبێ هەمیشە بگەڕێینەوە بۆ عەشیرەت!

ئەمەیە فەلسەفەی عەقڵی ڕابردوومان، ئەمەیە ئەو دەرسە ئەخلاقییەی کە هونەری کۆنی کوردی فێرمان دەکات؛ بۆیەش هەر ئەمەیە بنچینەی تراژیدیا و هونەری داهێنان: تاکەکەس یان گەنجی عاشق و یاخی، چەند بەهێزیش بێت بەڵام لەکۆتاییدا لەو یاخیبوونەی خۆیدا هەرەس دێنێ..

کەواتە، ئێستا دەتوانین وەڵامی پرسیارەکە لە سینتێزێکدا دابڕێژینەوە و بڵێین: هەموو دیاردە و ئاماژەکانی سەدەکانی ڕابردووی کوردستان ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کە لەنێو ڕابردووە دوورەکانی وڵاتی ئێمەدا ململانێی نێوان

نەسلەکان (ململانێی نێوان گەنج و پیر، ململانێی نێوان عەقڵی نوێ و عەقڵی کۆن) لەشێوەی یاخیبوونێکی سادەدا یان لەشێوەی ڕاکردنێک لەدەست واقیع هەبووە، بەڵام لەو ململانێیەدا، هەمیشە نەسلی نوێ (واتە گەنج) تووشی هەرەس یان تێکشکان هاتووە! ئەوەتا هەمـوو بەیت و داستان و لاوکەکانمان کۆتاییەکی تراژیک و کۆستکەوتوویان هەیە؛ هەموو گەنجە پاڵەوانە یاخیبووەکانمان (فەرهاد، سیامەند، سوارۆ، مەم..) کاتێ هاتن یاخی بوون و ڕەفزی عەشیرەت و دەسەڵاتیان کردەوە: لەناو خوێنی خۆیاندا گەوزان! ئەوەتا تا ڕۆژی ئەمڕۆش ئێمە دادەنیشین بەدیاریانەوە دەگرین؛ وەک ئەوەی ئێمەش بۆ ئەنجامی چاوەڕوانکراوی یاخیبوونەکانی داهاتووی خۆمان بگرین: «های سوارۆ، چەندم پێ گۆتی مەڕۆ بەتەنێ..».

نەتەوەیەک، ئنجا، کە سەدان ساڵە خاوەنی ئەم کولتوور و نائاگاییە کۆللەکتیڤە سەپاوە بێت، کە ئەم عەقڵیەتە کلاسیکە پڕ کۆیلایەتیە لەناو خوێن و هەستیدا ڕەگاژۆ بووبێت، ئایا ئەمڕۆ، گەنجی کورد، چۆن ڕاکردن بەرەو ئەورووپا بە لەپێشتر و ئاسانتر و خۆشتر نەزانێ لەچاو مانەوە لەناو واقیعەکەدا؟ ئەگەر سوڕ بزانێت چارەنووسی یاخیگەرانەی ئەویش وەک چارەنووسی سیامەند و مەم و سوارۆ بێت، چۆن هەقی نەبێت سەری خۆی هەڵگرێت بەرەو ئەورووپا و پاشانیش بەم وڵاتە جوانە پانوپۆڕە ئازیزەش نەڵێت (گوو بەو کوردستانەی دەڵێی عەشیرەتێکی گەورەیە و بەستبوومیەوە، کە دەڵێی باوکێکی زاڵمە و دەرگای لەسەرم داخستبوو)!

نەتەوەیەک، کە سەدان ساڵە خاوەنی ئەم کولتوور و نائاگاییە کۆللەکتیڤە سەپاوە بێت، کە ئەم عەقڵیەتە کلاسیکە پڕ ترسنۆکییە لەناو خوێن و هەستیدا ڕەگاژۆ بووبێت، ئایا ئەمڕۆ، گەنجی کورد، چەند دەرۆستیدا دەبێ یاخی ببێت؟ چۆن دەتوانێ دەرەقەتی نەسلە کۆن و پیرەکە بێت؟ ئایا ئەم کارە کارێکی ئەستەنگ نیە؟ بەتایبەتیش چونکە، نەسلە کۆن و پیرەکە ئەگەر جاران تەنیا حوجرە و دیوەخان و ڕمب و سێ تیرەیان هەبوو، ئەوا ئەمڕۆ پۆلیس و ئەنجوومەنی زانکۆ و عەمید و ڕەئیس و تانک و سەتەلایت

و ڕۆژنامە و قانوون و هێزی ئاسایش و قەرەوێت و حیمایەشیان هەیە بۆ سەرکوتکردنەوەی بزاڤی گەنج و خوێندکاران! ئایا لەناو ئەم واقیعە تازەیەدا یاخیبوونی گەنجانە و خوێندکارانە چەند گەرەنتیی ئەوەی هەیە سەربکەوێت؟ ئایا گۆڕانی ئەم کولتوورە تۆتالیتارە بەرەو کولتوورێکی دیموکرات و کراوە کارێکی ئەستەم نیە؟

ئەم کتێبە، بەشێوەیەکی مێتۆدۆلۆژیک و ئەکادیمی نا (کە قەرەوێتە زانکۆییەکان پێی ڕاهاتوون بۆ تەرقیەکردن و ئامانجە شەخسیەکانیان بینووسن) بەڵکو - دانی پێدا دەنێم - دوژمنکارانە و یاخیگەرانە، لە قووڵایی شەقام و سەرشۆستە محەجەبەکانەوە، لە کانگای بێنازی بەشە ناوخۆییە بێ کارەباکانەوە، لە تاریکترین گۆشەی تاریکی ژیانی گەنج و قوتابیانەوە، هەوڵدەدات چەند تیشکێکی کز پەیدا بکات و بیانخاتە سەر ئەم پرسیارانەی سەرەوە...

# گەنجێتییەکی سەربڕاو
# پیرییەکی هەمیشەیی

لەبیرم کرد لە لاپەڕەکانی ڕابردوودا پرسیارێک لە خۆم بکەم، پرسیارێکی زۆر گرنگ - کە وەڵامەکەی، بێگومان، حەماقەتی مامۆستا و پیرە دەسەڵاتدارەکانی کورد ڕوون دەکاتەوە؛ دوژمنداریتییان ڕوون دەکاتەوە دەرهەق بە نەسلی گەنج و قوتابی:

ئایا بۆچی تا دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم - لە چەند شاعیرێک زیاتر لە هەر سەدەیەکدا شیعریان بە کوردی نووسیوە - هیچ مەلا و شێخ و میر و کوێخا و میرزایەک (کە منەووەرەکانی ئەوکاتە بوون) نەهاتوون کتێبێک لەبارەی ژیان و کۆمەڵ و زانست و هەر چی شتێکی دیکەوە بە کوردی بنووسن؟

بۆچی ئەگەر چەند کتێبێکیشیان نووسیبێت ئەوا تەنیا بە زمانی تورکی یان فارسی بەتایبەتیش بە زمانی عەرەبی بووە؟ ئەمەتا شاعیرێکی گەنجی کۆتایی سەدەی نۆزدەم، حاجی قادری کۆیی، یاخیگەر، ڕەخنە لەم بێ عەقڵی و خۆ بە کەم زانینیەی نەسلی ڕووناکبیرانی پێش خۆی دەگرێت و دەڵێ (حەیف):

کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز
بە کوردی گەر بنووسرایە زەمانی
مەلا و میر و پادشاما ن
هەتا مەحشەر دەما ناو و نیشانی

هیچ خواجە و خان و مەلا و میر و موفتی و مورید و میرزایەک (کە منەووەرەکانی ئەوکاتە بوون) هیچ نووسراوێکیان (لە شیعر زیاتر) بە زمانی کوردی نەنووسیوە؟ دیسان هەر هەمان شاعیری گەنجی یاخی، کە سەر بە نەسلێکی تازەی ڕاچەنیوی کۆتایی سەدەی نۆزدەیە، بە هوشیارییەکی هێرشکارانەوە دژی مەلا و «عولەما» و ئوستادە کۆنەکانمان، گەواهیمان بۆ دەدات:

هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت
بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت
یەکسەر عولەما درشت و وردی
ناخوێننەوە دوو حەرفی کوردی
ئوستادی خەتن لە ئەم سیانە
وەک دی لە زوبانی خۆیدا نەزانە

هۆی ئەمە، بێگومان، تەنیا ئەوە نەبووە کە مێژوونووسەکان دەڵێن: وەڵا چونکە چاپخانە نەگەیشتبووە کوردستان (خۆ لە سەردەمی ئەحمەدی خانیی مەزنیشدا چاپخانە نەگەیشتبووە کوردستان!)، هەروەها تەنیا ئەوەش نەبووە کە ناسیوونالیستە توندڕەوەکان دەڵێن: وەڵا نەتەوەکانی باڵادەست (تورک و عەرەب و فارس) هانی نووسینی کوردییان نەداوە یان ڕێگەیان لە نووسینی کوردی گرتبێ (ئەگینا مەلای جەزیری چۆن وێراوە بە کوردی شیعر بنووسێ؟).. هۆی سەرەکی، بە باوەڕی من، لەوەدایە کە خواجە و کوێخا و مەلا و میر و موفتی و میرزاکان، واتە نەسلی پیری دەسەڵاتدار، نەیانویستووە نەسلی گەنج و نەوجەوان و قوتابی (واتە شاگرد و سوختە و موستەعید و فەقێکان) لەو نیعمەتە بەهرەمەند بن کە ناوی خوێندەواری و ڕۆشنبیری و هونەر و زانستە! ئەمەش چونکە، هەموومان دەزانین: توانای نووسین و خوێندنەوە، یان سوودوەرگرتن لە زانست و ڕۆشنبیری و هونەر، گەنج و خوێندکاران دەگەیەنێتە لێوارەکانی یاخیبوون و ئازادی؛ ئەمەش مەترسی دروست دەکات بۆ سەر دەسەڵاتداری پیر و میر و مەلا.
موفتی و مەلا و میر و مننەوەرەکانمان (چەند تاکێکی وەک شەرەفخانی بەتلیسیی لێ بترازێ - کە ئەویش هەر بە زمانێکی غەیرە کوردی نووسیویەتی) لە بەرژەوەندییاندا نەبووە «تەنانەت هەر دژی بەرژەوەندیی ئەوان بووە» کە خەڵکی نەوجەوان و گەنج و شاگردەکانیان (ئافرەت ئەوا هەر هیچ) فێری خوێندەواری و زانست و هونەر بن و بیریان ڕووناک بێتەوە. بۆیە نەک هەر هانی خەڵکە ڕەشوڕووتەکەیان نەداوە فێری خوێندەواری بن، بەڵکو بۆ خۆیشیان کاتێ کتێبێکیان نووسیبێت ئەوا

هاتوون تەنیا بە زمانی عەرەبی یان فارسی و تورکی ئەو بەرهەمەیان نووسیوە. ئەمەش بۆئەوەی تەنێ چەند کەسێکی ئەو توێژە منەووەرە باڵادەستە سوودمەند بێن کە لە سەدا سەد نەک هەر مەترسییان بۆ سەر کولتوورە کلاسیک و باوەکە نیە بەڵکو هەر خۆشیان بە گەرەنتییەکی دڵنیاوە پارێزگاری ئەو کولتوورە تۆتالیتارەن و دەروێشی دەسەڵاتە مەعریفییە کلاسیکەکەن. لەلایەکی دیکەشەوە، دیسان، بەم پێودانگە، لەوەش دڵنیا بوونە کە ئەو چەند گەنجە فەقێ و موستەعید و شاگردەی عەرەبی یان فارسی یان تورکی دەزانن ژمارەیان زۆر زۆر کەمە و لەسۆنگەی ئەم ژمارە کەمییەی خۆیان ناتوانن هیچ هێز و مەترسییەک بۆ سەر ئەوان و دەسەڵات دروست بکەن.



بەکوردی نووسین یان توانای کوردی خوێندنەوە، یان تەنانەت هەر فێری خوێندەواری بوون و ڕۆشنبیربوون، لە دیدی ئەو مەلا و میر و منەووەرە پیرانەدا، دەکاتە: مەترسیی ئەوەی بەرژەوەندی و پایە و بەهاکانی خۆیان بەسەر خۆیاندا قەڵب ببێتەوە. بۆیە زۆربەی هەرە زۆریان، نەک هەر بەلایانەوە گرنگ نەبووە خەڵک فێری خوێندەواری و نوسین بە کوردی و خوێندنەوە بە کوردی بکەن، بەڵکو ڕێگەشیان لێ گرتووە؛ تەنیا ئەوەیان لەلا بەس بووە چەند ژمارەیەکی کەمی فەقێ و شاگرد لە حوجرەکانیاندا ڕابگرن ئەویش لەژێر سانسۆر و زەبری دارحەیزەراندا!

بەم شێوەیە، ئیتر هەر نەسلێکی پیری مامۆستا و مەلا، لەلایەن نەسلێکی دیکەی پەروەردەبووی دەستی ئەو نەسلە کەرەی پێشوو جێگەی گیراوەتەوە. هەر نەسلێک چەند تەمەنی زیاتر هەڵکشابێ، ئەوەندە زیاتر لە غەمی لغاوکردنی نەسلە گەنجەکە بوو. ئیتر بەم شێوەیە، نەسلە گەنجەکەش، کاتێ وردە وردە ئەو - بۆ خۆیشی کاتێ تەمەنی گەیشتۆتە تەمەنی پیری، ئەویش بە هەمان شێوە بۆتە هەمان مامۆستای تۆتالیتاری کە بیەوێت ئەویش لە خۆی گەنجتر بچەوسێنێتەوە. بەم شێوەیە ئیتر بواری هیچ هەناسەدانێکی گەنجانەیان نەهێشتۆتەوە؛ ئەسڵەن گەنجێتییان لە کۆمەڵی خۆیاندا سەربڕیوە؛ وایان کردووە تا هەتایە تەنیا عەقڵی پیر و زەوقی پیر و ئەخلاقی پیر دەسەڵاتدار بێت و باو بێت. وەک حاجی کۆیی دەڵێ:

صەد شێخ و مەلا و ئەمیر و خانی<br>بۆ لەززەتی عەیش و زیندەگانی<br>لەولاوە ئەوان بە حیلەسازی<br>لەملاوە ئەمان بە تەقلەبازی<br>قوڕیان بە هەموو وڵاتەوە دا<br>تا موڵک و ڕەعیە پاکی فەوتا

وڵاتێک، ئنجا، کە سەدان ساڵە خاوەنی ئەم کولتوورە تۆتالیتارە بێت، کە ئەم عەقڵیەتە کۆن و پیرە پڕ ستەمە لەناو خوێن و هەستیدا ڕەگاژۆ

بوو‌بێت، ئایا ئامادەیی ئەوەی دەبێت کە خۆی بنووسێتەوە؟ ئارەزووی ئەوەی دەبێت هوشیاریی خۆی و ئاگایی خۆی لەبارەی خۆی و سەردەمەکەیەوە بنووسێتەوە؟
بێگومان: زەحمەتە، چونکە ئەم شتانەی دەیاننووسێتەوە، شتی ئاوها نابن شانازییان پێوە بکات.

نەتەوەیەک، کە مەلا و میر و مامۆستاکانی، سەدان ساڵە بە هەنجەتی دین و شتی دیکەوە، هاتبن دینامیکیەتی زانست و هونەر و ڕۆشنبیری لە گەنج و قوتابی حەڕام بکەن و بە هەرچی شێوەیەکی پێیان کرابێ گەنج و فەقێ و شاگردیان بە چاوی «کۆیلەی زانست» و خزمەتکاری خۆیان تەماشاکردبێت، ئایا چاو و ڕووی ئەوەی دەبێت کە بیرەوەرییەکانی خۆی بنووسێتەوە؟
بێگومان: زۆر زەحمەتە، چونکە ئەم شتانەی دەیاننووسێتەوە، دژی بەرژەوەندییەکانی خۆیان و شۆرەت و مەجدی خۆیان دەکەوێتەوە.

هەر لێرەشەوە، سەدەکانی ڕابردوو خاسیەتێکی شەرمەزاری هەیە لەم بەستێنەدا ئەویش ئەوەیە کە هیچ هۆشیارییەکیان لەبارەی خۆیانەوە نەبووە؛ هیچ هوشیارییەکمان لەبارەی خۆیانەوە ناداتێ. ئەمەش بەبێچەوانەی (ئەمڕۆ) کە جوڕئەتی پەیدا کردووە هوشیارییەک لەبارەی خۆیەوە ببەخشێت و خۆی بنووسێتەوە!

کۆمەڵگەیەک، کە سەدان ساڵە گەنج و قوتابییەکانی بە ترس لە ئازادی و سڵەمینەوە لە یاخیبوون گۆشکراون، هەروەها کە ئەم حەز و ئاواتەی ڕازیکردنی مامۆستا و لەخۆگەورەتر لەناو خوێن و هەستیاندا ڕەگاژۆ بوو‌بێت، ئایا وزە و جەسارەتی ئەوەی دەبێت کە ئەم مەعریفە ترسنۆک و شەرمەزارەی خۆی بنووسێتەوە؟
بێگومان: نەخێر، چونکە ئەم شتانەی حەزدەکات بیاننووسێتەوە، ناوێرێت بیاننووسێتەوە؛ ناتوانێ تەنانەت بشزانێت چۆن بتوانێت.

ئەوەتا، کەواتە، ئەمەیە هۆی ئەوەی کە هیچ نەسلێک لە نەسلەکانی ڕابردوو، هیچ نەوەیەک لە نەوەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی کوردستان و دوواتریش (نە پیر نە گەنج، نە مەلا نە فەقێ) نەهاتن - بە غەیری شیعر - مەعریفەیەکمان لەبارەی خۆیان و سەردەمی خۆیانەوە بە زمانی کوردی بۆ بەجێ بهێڵن. ترسنۆک بوون، چاو و ڕووی ئەوەیان نەبوو هیچ وێنەیەکمان بۆ لەبارەی واقیعی زوڵم و ستەم بۆ تۆمار بکەن، نەوێران بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە بدەن کە لە زەمانی ئەواندا زوڵم هەبوو، ڕیسواکردنی گەنج و قوتابی و ژن هەبوو؛ خەساندنی هێزی گەنجانە و وزەی لاوان و ئافرەتان هەبوو - کە بۆ خۆشیان، چ بکەن - داردەستی یان شاهێدێکی ڕازی و لاڵ و ترسنۆک بوون لە هەمبەر ئەو ستەمە.

کەواتە، هەر ئەمەشە هۆی ئەوەی کە لە زەمان و سەردەمی هیچ نەسلێکدا، بەدرێژایی مێژووی کوردستان، هیچ پەنجەرەیەک بەسەر کولتوورێکی بیانی و ڕۆژئاوایی غەیری ئەو کولتووره کوردی - ئیسلامییە نەکرایەوە؛ هەر بۆیەش هیچ ژانرێکی ئەدەبیی غەیری شیعر بە زمانی کوردی لەدایک نەبوو: هیچ شسانۆنامەیەک، هیچ ڕۆمانێک، هیچ چیرۆک و نۆڤلێتێک، هیچ سەفەرنامە و ژیاننامەیەک، هیچ وتارێک بەو زمانە شیرینەی کوردی نەنووسرا کە ژیانی ئەو زەمانە سەقەت و سوقەت و پیرانەمان بۆ بگێڕێتەوە.

هەر ئەمەشە هۆی ئەوەی کە لە زەمان و سەردەمی هیچ نەسلێکدا، تەنانەت لەناوجەرگەی ئەو پایتەختە زێرەوشانانەی وەک دیاربەکر و بەتلیس و ئەردەڵان و جەزیرەش - کە بە خۆشم و مێژوونووس و ناسیووناليستەکانمانەوە شانازیيان پێوە دەکەین -، هیچ هەرایەکی ڕۆشنبیری نابینین، هیچ بشێوبیەک دروست نابێ؛ هیچ کتێبێک نیە هیچ گفتوگۆیەک بنێتەوە؛ بەکورتی: هیچ درزێک ناکەوێتە قاڵبی مەحکەمی ئەبستمۆلۆژیای کوردییەوە. بەدرێژایی مێژووی کوردستان هیچ ڕاپەڕینێکی فەقێ و مەلاکان لە کوردستاندا نابینین؛ تەنیا یەک یاسا باڵادەستە:

خزمەتکردنی دین و هونەری دین و زانستەکانی دین. ئەمەش تەنیا و تەنیا بە زمانی فارسی و تورکی و بەتایبەتیش بە عەرەبی. هەرچی موفتی و مورید و مەلا و میرزا و خواجە و کوێخا و ئاغاکانی کوردستان هەبووە لە خانەقا و تەکیە و حوجرەکاندا هەموویان پێکەوە باوەڕیان وابووە کە:

«عەرەبی هونەرە
فارسی شەکەرە
کوردی گووی کەرە..»

مەلا م. بایەزیدی لە (عادات و ڕسووماتنامەی ئەکرادیە)دا، گەواهی دەدات: «دنێڤ ئەکراداندا مەکتووب و کاغەزێد وان فارسی العبارە دبن».

بەم شێوەیە، نەسلەکانی ڕابردوو، نەهاتن بە زمانی کوردی مەعریفەیەکمان لەبارەی خۆیان و سەردەمی خۆیانەوە بۆ بەجێ بێڵن: تەنێ لە بەستێنی خزمەتکردنی زانستەکانی دین نەبێ، ئەویش تەنێ بە عەرەبی و تورکی و فارسی. ئەمەش بۆ ئەوەی تەنێ توێژێک، تەنێ ئەو کەسانە لێیان تێ بگەن و هوشیارببنەوە کە دەروێشی خۆیان و پارێزگاری کولتوورە تۆتالیتارە چەوسێن و داپڵۆسێنەکەن: خۆیان و دەروێش و میر و مەلا و میرزا و فەقێ بەستەزمانەکان..

لێرەوە، ئێستا دەتوانین سینتێزێکی دیکە بنووسین:

سەدەکانی ڕابردوو هوشیارییان نیە لەبارەی خۆیان، بەڵام (ئەمڕۆ) ڕۆشنبیریی ڕەخنەگرانەی خۆی پێیە.

کەواتە، یەکێک لەو نیشانانەی کە ئەمڕۆمان لە سەدەکانی ڕابردوو جودا دەکاتەوە ئەوەیە کە سەدەکانی ڕابردوو هیچ هوشیارییەکیان لەبارەی خۆیانەوە بەرهەم نەهێناوە، بەڵام (ئەمڕۆ) بەوە دەناسرێتەوە کە هوشیارییەکی بەردەوام و تیر و پڕ، تەنانەت پڕ وردەکاری، لەبارەی سەردەمی خۆیەوە بەرهەم دەهێنێت. هەر ئەمەشە کەترووسکاییەک ئومێد دەبەخشێتە ژیانی گەنج و باوەڕی قوتابیان و نەسلێ نوێیی ئەمڕۆ..

# زمانی حەیزەران

ئەمڕۆ با وابێ بەڵام ڕۆژێ ئەبێ ئەولادی کورد
دێنەوە مەیدان بە عیلم و سەنعەت و عیرفانەوە
احمد موختاربەگی جاف

ئایا ململانێی توێژی مامۆستا و قوتابی لە کۆندا هەبووە؟ ئەگەر هەبووبێ، سروشتی ئەو ململانێیە چۆن بووە؟

لە سەدەکانی ڕابردوودا بە زمانی کوردی ژیان نەنووسراوەتەوە. زۆربەی کتێبەکان -ئەگەر نووسراو ئەگەر وەرگێڕدراو- لەبارەی دینی ئیسلامەوە بوون «ئەویش هەموویان بە زمانەکانی غەیری کوردی». بۆیە ناتوانین بزانین ئاخۆ وردەکارییەکانی ئەو ململانێیە چۆن بووە؟ بەڵام لەوە زۆر ئەرخاین و مسۆگەرین کە زوڵم و زۆرێکی لەڕادەبەدەر هەبووە لە هەمبەر گەنج و قوتابیانەوە. ئەمەش بەپێی چەند بەڵگەیەک کە خودی ئەو بەڵگانە سروشتی زوڵم و زۆرەکە دەگێڕنەوە.



پێش نیشـاندانی ئەو بەڵگانە با جـارێ ئەوە بزانین کـە ئەو وەختـە سیستەمی خوێندن کە پێی دەگوترا (فەقێیاتی) یان (خوێندنی حوجرە) بەپێی قۆناغی یەک لەدووای یەکی خوێندن بەم شێوەیە بووە:

- سوختە  لە ٨ تا ١٢ ساڵیەوە دەستی بە خوێندن دەکرد
- موقەدیمات خوێن  کە بەرامبەر (ناوەندی) بوو.
- ناسکە موستەعید  کە بەرامبەر (ئامادەیی) بوو.
- موستەعید  کە بەرامبەر (زانکۆ) بوو.

منداڵ کە دەگەیشتە ئەوەی بەچاکی بزانێت تا بیست بژمێرێ، سیپارەیان بۆ دەکرد، بە (یا فتاح یا رزاق..) دەستی دەکرد بە حونجەکردنی پیتەکانی زمانی عەرەبی. ئنجا جزوعەممەی دەخوێند و پاشان هەر (٣٠) جزمی تەواودەکرد.

هەندێک لەو شانزە دەرسانەی کە سوختە دەیخوێندن ئەمانە بوون: (ئەحمەدی) کە زانستی زاراوە بوو، عەوامیلی جورجانی (زانستی نەحو)، مەقصود (زانستی حەرف)، سەعدەدین لەگەڵ حاشیەی میسری (زانستی صرف)، ئیستیعارە (زانستی ڕەوانبێژی)، وضع (زانستی دانان)، صەرفی شەرحی مەعنا (زانستی نەحو).

هەندێ لەو یانزە دەرسانەیش کە موستەعید دەیخوێندن ئەمانە بوون: شرح العقائد (زانستی کەلام)، مختصر المعانی (ڕەوانبێژی)، جمع الجوامع (زانستی اصول الفقه)، تهذیب الکلام (زانستی کەلام)، خلاصە الحساب (ژمێریاری)، زانستی شەو و ڕۆژ و کاتی نوێژەکان.

ئامانج و ناوەڕۆکی ئەم سیستەمەی خوێندنی فەقێیاتی، پێش هەموو شتێک و بە پلەی یەکەم لەپێناو ئەوەدا بوو کە فەقێ بتوانێت قورئان ئەزبەر بکات؛ بتوانێت لە ناوەڕۆکی ئیسلام تێ بگات و بەناو ئامانجەکانی ئیسلامەتیدا قووڵ ببێتەوە! بۆ دەرس گوتنەوە، مەلا، لە ئاستی عیلم و شارەزایی جۆراوجۆردا وانەی دەگوتەوە. مەلای کورد هەندێ جار چۆتە تاران و شام و حیجاز و شەنگەهای و بوخارا و سەمەرقەند و مەراکش.

له بابا تاهیری هەمەدانییەوە بگرە تا دەگاتە نالی و مەحوی بەپێی ئەم سیستەمەی فەقێیاتی لە حوجرەدا خوێندوویانە، هەروەها شێخ ڕەزا و کەیفی لە مزگەوتی گەورەی کۆیە فەقێ بوونە، کە پاشان هەر خۆشیان بوونەتەوە مەلا و مامۆستا.. تەنانەت زێوەر و هەندێ شاعیرانی سەرەتای سەدەی بیستەمیش لە حوجرەدا خوێندوویانە.

هەڵبەتا دیارە سیستەمی خوێندنی فەقێیاتیش هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلامەوە بۆ کوردستان (دەوروبەری ٦٣٥ ز. بەرەو سەرەو) بڵاوبۆتەوە. واتە (١٤٠٠ ساڵێک) زیاتر ئەم سیستەمی حوجرەیە لە کوردستاندا باو بوو (ئێستاش لەم دەیەی دوواییدا لەڕێگەی کۆلێژی شەریعە و خوێندنی ئیسلامییەوە دووبارە لە ئاستێکی باڵاتردا سەری هەڵدایەوە).

لە زەمانی فەقێیاتیدا زمانی خوێندن بۆ نموونە لە سلێمانی بە فارسی بووە، بەڵام عەرەبیش ڕۆڵی سەرەکی هەبووە و مەرجێکی فەقێیاتی بووە. سەبارەت بە کاریگەرێتیی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، تورکیشیان کەمێک زانیوە. لەبارەی کوردیشەوە، تەنیا هەندێک لە مەلا کوردەکان زمانی کوردییان لەناو حوجرەدا بەکارهێناوە. بەڵگەشمان ئەوەیە کە ئەحمەدی خانی و شێخ مارفی نۆدێیی هەر یەکەیان قامووسێکی عەرەبی - کوردییان بۆ منداڵان نووسیوە بۆ فێربوونی عەرەبی. سەیر لەوەدایە؛ کە ئەم قامووسانەش هەر بۆ فێربوونی عەرەبی بووە نەک بۆ بەکارهێنانی کوردی لەناو حوجرەدا.

گوتمان: ئەرخاین و مسۆگەرین کە زوڵم و زۆرێکی لەڕادەبەدەر هەبووە لە هەمبەر شاگرد و قوتابیانەوە. ئەمەش بەپێی چەند بەڵگەیەک:

(١)

کتێبی (ڕشتەی مرواری) کە ناوی کتێبێکی چەند بەرگیە و مەلایەکی زانای وەک عەلادین سەجادی نووسیویەتی، پڕە لە حەکایەتی ئەو مەلایانەی سەدەکانی هەژدە و نۆزدە کە غەدر و ناهەقی بەرامبەر فەقێ و سوختە و موستەعید و شاگردەکانیان (واتە بەرامبەر گەنج و نەوجەوان و

قوتابی) دەکەن! (ئەمە بێ ئەوەی باسی ئەو غەدر و تەڵەکەبازیانە بکەین دەرهەق بە خەڵکی عەوام و ڕەشوڕووت!).
وێنەی مەلا- مامۆستا، کە ڕەمزێکی دیاری نەسلی کۆنی دەسەڵاتدارە، بەپێی ئەو حەکایەتانەی (ڕشتەی مرواری) بریتییە لە وێنەی زاڵم، دکتاتۆر، سەرکوتکار، کە نەک هەر ڕێگە نادات فەقێ و شاگرد و موستەعید و ناسکە موستەعید و سوختە (گەنج و نەوجەوان و خوێندکار) یاخی ببن، بەڵکو دەشیانچەوسێنێتەوە، زۆر جار هەڕەشە لە کەرامەتیشیان دەکات.

(٢

وا پێدەچێ سیستەمی خوێندن، هەروەها ئەو بابەت و دەرسانەی لە حوجرە و و مەدرەسەکاندا گوتراونەتەوە (قەید و تەذبیب و شەرح و حاشیەکان...) ئەوانیش هەر بەرباد و بێکەڵک بوونە و سوودێکی ئەوتۆیان نەگەیاندۆتە فەقێکان و هەر نەسلێکی گەنجی تازە. بەدرێژایی سەدان ساڵ هەمان سیستەم، هەمان کتێب، هەمان دەرس، هەمان مەعریفەی باوی سواو خۆی دووبارە کردۆتەوە: بێ ئەوەی هیچ ئەبستمۆلۆژیایەکی نوێ دابهێندرێت کە لەگەڵ واقیعی تازەی کوردستان و لەگەڵ ژیانی جیاوازی ئینسانی جیاوازی هەر قۆناغێک یەکتر بگرێتەوە. تەماشاکە گەنجێکی یاخی، کاتێ خوێندنی فەقێیاتی تەواو دەکات و ڕوودەکاتە ئەستەمبۆڵ، چۆن لەوێ چاوی دەکرێتەوە و تێدەگا کە ئەو مەلای دەرس و موفتییانەی کوردستان چەندە گەوج بوونە، چۆنیش هەر هەمان سیستەمی خوێندن لە کوردستاندا ببووە بەربەستێک لە بەردەم پێشکەوتنی قوتابی و گەنجی کورد:

ئێستە مەعلوومی بوو هەموو میللەت
ئەی مەلای دەرس و موفتیی ئوممەت
قەید و تەذبیب و شەرح و حاشیەکان
بوونە سەددی مەعاریفی کوردان

یان لە شیعرێکی دیکەیدا، حاجی، گەواهی لەسەر فەسادی سیستەمی خوێندن دەدات و ڕەخنە لە ناوەڕۆکە مەعریفییە پووچ و ئیفلیجەکە دەگرێت

و بەزەیی بە حاڵی مەدرەسەدا دێتەوە و دەڵێ:

مەسجید و میحراب و مینبەر بێکەسە
هەر مەپرسە حاڵی چۆنە مەدرەسە

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بەملاوە، شاعیرانی کورد، دەست دەکەن بە پەیداکردنی هوشیاری و وردە وردە ڕەخنەگرتن. بێداردەبنەوە و وێنەیەکی گشتیمان پێ دەبەخشن لەبارەی دکتاتۆریەتی مەلاکانی کوردستان و تەڵەکەبازییان. ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆئەوەی بزانین ڕەفتاریان لەگەڵ سوختە و موستەعید و فەقێکان چۆن بووە. با پێکەوە ڕای شاعیرانی وەک مەحوی و بێخود و نالی و بێکەس و ئەوانی دیکەی ئەو زەمانانە بخوێنینەوە. لەم بارەشەوە حاجی قادری کۆیی لە هەموویان بوێرتر دەردەکەوێ:

هەر شێخێ کەوتە شوێنی یەک دوو کەسی ڕەش و ڕووت
خەڵکی بە موور دەزانێ خۆی حەزرەتی سلێمان

یانیش هێرش دەکاتە سەر مەلا مامۆستاکان و دەڵێ:

بلێ بەو سەرکزۆڵەی کوزپەرستە
بە چاوی کلدراو و ڕیشی پانی
کە نەفعێکت نەبێ بۆ دین و دەوڵەت
بە من چی نەقشەبەندی یانە مانی

## ٣)

ئاشکرایە حەکایەتە میللی و فۆلکلۆرییەکان گەواهیدەرێکی زیندووی دیکەی واقیعی ئەو سەردەمانەن کە دەماودەم ڕۆڵەکانی گەل بۆ یەکتریان گێڕاوەتەوە. با لەم حەکایەتە ورد بینەوە، کە ئێستاش لەناو خەڵکدا باوە و سروشتی ئەو پەیوەندی و ململانێیە ڕوون دەکاتەوە کە لەنێوان مەلا-مامۆستا لەگەڵ فەقێ - قوتابی دا هەیبووە. دەگێڕنەوە دەڵێن:

«مەلایەک هەبوو دەرسی لە حوجرەدا دەگوتەوە. مرخی لە سوختەیەکی خۆی خۆش کردبوو. ئەو سوختەیەش، بەستەزمانە، دەیزانی کە ئەو مەلایە مرخی لێی خۆش کردووە و مەرەقی لێی داوە: بۆیە هەمیشە لێی دەترسا و لێی دەسڵەمایەوە، هەر بۆیەش لە دەرسەکانی ئەو هیچ تێ نەدەگەیشت.

مەلا هەموو ڕۆژێک دەرسی شەرح دەکرد، سوختەی بەستەزمان هەموو ڕۆژێک - لەترسان - هیچ تێ نەدەگەیشت. مەلا دەهات دەرسەکەی دووبارە دەکردەوە، سوختەی بەستەزمان دیسان هیچی لێ تێ نەدەگەیشت. بەم شێوەیە، ڕۆژێک مەلا هەڵدەستێ سوختەکەی خۆی دەباتە پەنایەکەوە و کاری خۆی لەگەڵدا دەکا و دەڵێ: تێ ناگەی! وەرە با ئیشت ببینم!

سوختە، بەستەزمان بەستەزمان، دەگەڕێتەوە ماڵ و بۆ باوکی خۆی دەگێڕێتەوە کە مەلای مامۆستای چ بەدڕەوشتییەکی لەگەڵ کردووە. باوکی سوختەش هەڵدەستێ دەچێتە لای مەلا، دەڵێ:

- مەلا، ڕاستە: تۆ ئاوهات لە کوڕەکەی من کردووە؟

مەلا دەڵێ: بەڵێ، ئا.

باوکی سوختە دەڵێ: بۆچی؟

مەلا دەڵێ: چونکە لە شەرحی دەرسەکە تێ نەدەگەیشت.

باوک دەڵێ: ئنجا باشە ئەگەر سوختەیەک تێ نەگات، دەبێ ئاوهای لەگەڵ بکەی؟!

- چی بکەم! تێ نەدەگەیشت.

باوک دەڵێ: ئی باشە ڕێگەیەکی دیکەت لەگەڵ بەکارهێنایە بۆ تێگەیاندنی!

- چی بکەم، بەخوا هەموو ڕێگەیەکم لەگەڵی بەکارهێنا، فایدەی نەبوو، تێ نەدەگەیشت.

باوک دەڵێ: باشە، چۆن تێ نەدەگەیشت؟

مەلا دەڵێ: هیچ تێ نەدەگەیشت.

باوک دەڵێ: ئێ باشە تێت بگەیەندایە.

- هیچ هیچ تێ نەدەگەیشت.

- ئێ باشە چۆن تێ نەدەگەیشت؟ بۆچی؟

مەلا دەڵێ: چی بکەم؛ تێ نەدەگەیشت.

باوک دەڵێ: ئێ باشە بۆچی، چۆن تێ نەدەگەیشت، ئاخر..

مەلا لە باوکی سوختەکە تووڕە دەبێت و لەکۆتاییدا هەڕەشە لە ئەویش دەکات و دەڵێ:

- دەڵێی تۆش هەر تێ ناگەی..!؟».

ئەگەر سایکلۆژیەت و ئامانجی ئەم حەکایەتە تەنزاوییە لێکبدەینەوە، لە هەمـووی دیارتر بۆمـان ڕوون ببێـتـەوە ئەوەیە کـە گـاڵـتـەیەکی گـەورە بە دەسەڵاتی موتڵەقی مەلا - مامۆستا دەکات لە حاڵەتی زوڵم و لە حاڵەتی ناهەقبوونیدا. دیارە چیرۆکبێژ یان خەڵکی ڕەشۆکی یان قوتابی هەمیشە هیچ چەکێکی دیکەی نەبووە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خۆی لە مەلا - مامۆستا: تەنێ چەکی حەکایەت نەبێت!

(٤

چۆن ئێستا بەشە ناوخۆیی و خابگاکان، هەروەها هەموو ئەو شوێنانەی کە قوتابی و خوێندکار تێیاندا دەحەوێنەوە و دەخوێن، هەموویان هەر لەناو پیسی و نالەباریدا، هەموویان هەر زستانان لەناو سەرما و هاوینان لەناو گەرمایەکی کوشندەدا دەگوزەرێن و دەخوێن، دیارە ئەو زەمانیش بە هەمان شێوە، شوێنی ژیان و حوجرەکانی خوێندن گەلێک نالەبار و ناتەندروست بوونە. شیعرە ناودارەکەی نالی - لەو سەردەمانەی کە فەقێ بووە - بەڵگەیەکی زیندووی ئەم ڕاستیانەی سەرەوەیە:

وەک قەفەس ئەم حوجرە کون تێیە کەوا گرتوومیە ناو
تاروپۆی عەنکەبووتە، زۆرە لێی کردوومە داو
دوودی سەر میچی گوڵەنگی لەتلەتی دەسرازە کۆن
بان و دیواری بە میسلی لانکەی ئەجزا شکاو
هەر لە ئێستاوە وەها سەرمای تێدا سەرما دەبێ
ڕەنگە ناوی لێ بنێی چوار تاقی سەرما تێ خزاو
ئاسمان هەورین دەبێ، ئێمەش بە غەمگینی دەڵێین:
ئەی خودا چ بکەین لەژێر ئەم کاولەی کەس تیا نەماو؟

هەروەها (حاجی) گەواهیمان بۆ دەدات و دەڵێ کە لە کوردستانی ئەو زەمانە کۆنانەدا قوتابخانە و حوجرەکانی خوێندن هێندە کەساد و بەرباد بوونە کە دەتوانین بڵێین: «شارەکان بێ مەلا و مودەڕیس بوون».

( ٥

بەکورتییەکەی: قوتابی و خوێندکارانی ئەو زەمانە (سوختە و موقەدیمات خوێن و ناسکەموستەعید و موستەعید و شاگرد و فەقێکان) لە هەر سەدە و زەمانێکی جیا جیادا، لەلایەک ژمارەیان زۆر زۆر کەم بووە، لەلایەکی دیکەشەوە بە شێوازی جۆراوجۆری ترساندن و سەرکوتکردنەوە، یان بە ناوی دین و ئەخلاق و عەشیرەتگەری و گەورە و بچووکییەوە، هەمیشە چاوترسێن کراون و بە هیچ کلۆجێک نەیانتوانیوە یاخی بن یان تەنانەت هەر قولانجێکیش لە فەرمایشتی مەلا و مامۆستا و لەخۆگەورەترەکانیان دەربچن. ئەو شاگرد و ناسکە موستەعید و فەقێ و نەوجەوانە بەستەزمانانە - خواخوایان بووە تەنیا مەلا و مامۆستاکانیان لێیان ڕازی بن، هەموو تەمەننایان ئەوە بووە ئەم لەخۆگەورەتر و پایەرزانە زیاتریان دارکاری نەکەن و زیاتریان ڕیسوا نەکەن.

دەرچوون لە چوارچێوەی فەرمایشتەکانی مەلا و مامۆستا بریتی بووە لە دەرچوون لە چوارچێوەی فەرمایشتەکانی خوا و دین و مزگەوت. هەر موستەعیدێک، شاگردێک، موقەدیمات خوێنێک، فەقێیەک، تەنانەت هەر مەلا و مامۆستایەکیش -کە بە هیچ شێوەیەک نەبووە- ئەگەر ئەم چوارچێوەیەی شکاندبا و یاخی بووایە، ئەوا بەر نەفرەتی خوا و عەشیرەت و باوک و مامۆستا دەکەوت؛ دین و دنیاشی دەفەوتا و تا هەتایە بە ڕیسوا و بەدڕەوشت و نەفرەتلێکراو لە قەڵەم دەدرا. بۆیە ئیتر هیچ کەسێک نەک هەر نەیدەوێرا بیر لەم یاخیبوون و ڕچەشکاندنە بکاتەوە، بەڵکو پێشبڕکێ لەسەر ئەوەش دەکرا کێ بتوانێ بە باشترین شێوە لەم ڕازی کردن و چوونەژێر بارەدا بیباتەوە و یەکەم ببێت). ئیدی هەر بۆیەش، لەم هەموو سەدە خامۆشانەی ڕابردووماندا هیچ بشێوییەک، هیچ گرفتێک، هیچ یاخیبوون و هەرایەک ڕووی نەداوە؛ هیچ درزێک نەکەوتۆتەوە هیچ قاڵب و کۆڵەگە و کۆسپ و دیوارێکەوە. بەدرێژایی مێژووی کوردستان هیچ ڕاپەڕینێکی فەقێکان لە کوردستاندا نابینین، هیچ بزاڤێکی یاخیگەرانە و ڕیفۆرمیستانەی مەلاکان یان فەقێکان لە قامووسی کولتووری کورددا نیە: تەنیا لەبواری شیعری تەصەوفدا نەبێ (لەڕووی ناوەڕۆکەوە).

# ئەی ئازادی بگەڕێوە !

## والت ویتمان

ئەی ئازادی، شەڕ کۆتایی هات؛ بگەڕێوە!
ڕووتی لێ وەرگێڕە و لەمەولا باڵی خۆت بەسەرماندا ڕاخە،
چیتر دوودڵ مەبە، بەڕژدییەوە جیهان بخەرە ژێر دەستی خۆت.
پشت بکەرە ئەو وڵاتانەی ڕوویان لە ڕابردووە و
بەسەرچووەکان تۆماردەکەن،
پشت بکەرە ئەو گۆرانیبێژانەی
بە شکۆی سەرکەوتنەکانی پێشوودا هەڵدەڵێن،
پشت بکەرە سروودی دنیای ئاغاکان و زەفەری پاشاکان و کۆیلە
و چینەکانی پێشوو؛
بگەڕێوە بۆ ئەم دنیایەی کە ئەوەتا لە ئاستانەی داهاتوودایە.
دەست لەو دنیا دواکەوتووە بشۆ و
بیاندەرە دەست گۆرانیبێژەکانی سەردەمەکانی پێشوو،
ئەو ڕابردووە هەڵوەریوانە بدەرەوە خۆیان.
ئەوەی دەمێنێتەوە، ئەوەی لە گۆرانیبێژەکان جێ دەمێنێ، تۆی.
جەنگەکانی داهاتووش هەر لەپێناو تۆدا هەڵدەگیرسێن.
(تۆ تەماشاکە، جەنگەکانی ڕابردوو چۆن تۆیان ئاوها بە بار هێنا
جەنگەکانی ئەمڕۆش تۆ سەرلەنوێ بە بار دەهێننەوە).

کەواتە، دەی، ئەی ئازادی، بگەڕێوە!
بێ سڵکردنەوە، ڕووی جاویدانی خۆت بکەرە ئەو جێیەی تێیدا
داهاتوو لە هەموو ڕابردووەکان مەزنتر
بەپەلە و پتەو نەخشە بۆ دواڕۆژی تۆ دادەڕێژێ.

# صەفای صافی جەوانی ڕۆیی و
# دوردی دەردی پیری هات..

مەحوی

پێش باسکردنی قۆناغی نوێ و سەرهەڵدانی بیری یاخیگەرانە، دەمەوێ ئاماژەیەک بکەم بۆ دوو دیاردەی یاخیگەرانەی ناکام و نیوەچڵی ئەم بەستێنە:

١) شیعری تەصەوف

٢) شیعری یاخیگەرانەی چەند شاعیرێکی وەک حاجی قادری کۆیی

شیعری تەصەوف بریتییە لەو ڕاپەڕینە ڕۆحییەی کە دژی ستەمی دەسەڵات و کۆمەڵگەی پیر سەرهەڵدەدا. ئەم شیعری تەصەوفە -بەداخەوە- ڕاپەڕینێک نەبوو بەرەو دەرەوە، بەڵکو ڕاپەڕینێک بوو بەرەو ناوەوە، بەرەو کانگای شاعیر خۆی. یاخیبوونێکی ماسۆشیانەی نەزۆک بوو (بەرەو ناوەوە نەک بەرەو دەرەوە). سەرکوتکردنەوەی خۆ بوو نەک وێرانکردنی واقیع. ئەزیەتدانی خۆ بوو نەک ڕووشاندنی دیوار و کۆسپەکانی بەردەم نەوجەوان.

ڕۆژێک لەگەڵ یەکێک لە مامۆستا سەرپەرشتیارەکانم، کریسنتۆف بالایی، کە پرۆفیسۆرێکی گەنجی پسپۆڕی ئەدەبیاتی فارسی بوو لە زانکۆی سۆربۆن، باسی ئەوەم دەکرد کە ناسیونالیزم و ڕەخنەگرتن لە دەسەڵاتی نەتەوە باڵادەستە داگیرکەرەکان پێش ئەوەی لە ئەدەبیاتی ئەورووپاش سەرهەڵبدا لە شیعری کوردیدا -لای ئەحمەدی خانی ١٦٥٠-١٧٠٧- سەری هەڵداوە. گوتی:

- ئنجا تەنێ چەند دێڕە شیعرێک بووە و تەواو.. نەبۆتە ڕەوتێک.

کاتێ باسی ئەوەشم کرد کە ئێمەی کورد لە سەدەی یازدەهەمەوە نووسینمان بە کوردی هەبووە، دیسان گوتی:

- کوا؟ لە باباتاهیرتانەوە تا سەدەی پازدەهەم بۆشاییەکی گەورەتان هەیە.

لە دڵی خۆمدا گوتم: «ڕاست دەکا، لە ئەدەبی کوردیی دێرینماندا، هەر سێ سەد ساڵێک و تەنیا شاعیرێک پەیدا دەبێت و تەواو!»: باباتاهیر (٩٣٥- ١٠١٠)، مەلا پەرێشان (١٣٥٦- ١٤٢١)، ئنجا گوتم:

- بەڵام لە سەدەی شازدەهەمەوە گوڕێکی نوێ دروست دەبێت.

کریستۆف بالایی گوتی:

- موبالەغە مەکە. لە هەر سەدەیەکدا تەنیا شاعیرێکتان هەیە شایانی باس بێت.

لە دڵی خۆمدا گوتم «ڕاست دەکا، لە سەدەی شازدەمدا تەنیا مەلای جزیری (١٥٦٧- ١٦٤٠)، لە سەدەی حەڤدەمدا تەنیا خانی (١٦٥٠- ١٧٠٧)، لە سەدەی هەژدەمدا تەنیا خانای قوبادی (١٧٠٤- ١٧٧٨).

بەکورتی: لە ئەدەبی کوردیی کۆنماندا هەر سەد ساڵێک و شاعیرێک، هەر سێ چوار سەد ساڵێک و شاعیرێک - تەنیا شاعیرێک- پەیدا بووە کە شایانی باس بێت. لای ئەم تاقە شاعیرەش، لە دیدێکی ڕۆمانسیانە زیاتر هیچ تووڕەیی و یاخیبوونێک لەهەمبەر ستەمی کۆمەڵ و دەسەڵات نابیندرێ: تەنێ، وەک کریستۆف بالایی گوتی: چەند دێڕێکی ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی نەبێ!

لێرەدا کەواتە پێویستە خەت بەژێر چەند لاپەڕەیەکی مەلای جەزیری (١٥٦٧- ١٦٤٠)، بەتایبەتیش چەند لاپەڕەیەکی هەندێ شاعیرانی سەدەی نۆزدەهەم: مەحوی (١٨٣٠- ١٩٠٤)، مەولەوی (١٨٠٦- ١٨٨٢) پاشانیش حاجی قادری کۆیی (١٨١٥- ١٨٩٧) و شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٥- ١٩٠٩) دابهێنم و بەشێوەیەکی جیاواز ئاماژەیان پێ بدەم: چونکە ئەمانە هەندێکیان تەصەوف بوون و یاخیبوونیان تێدا بووە، هەندێکی دیکەشیان (دیارترین نموونە حاجی کۆیی) لەسەر بنچینەیەکی

ڕیالیستانە دڕیان بە واقیعەکەدا داوە و زەمینیەیان خۆشکردووە بۆ نەسلی نوێی دووای خۆیان کە بتوانن جورئەت بکەن بیر لە یاخیبوون بکەنەوە، یان هیچ نەبێ جیاواز بیر بکەنەوە.

ئەم یاخیبوونە کە تەنێ لە هەندێ شیعردا بەدی دەکرێت (نەک لە وتار و نووسینی پەخشاندا) هێز و بڕستێکی ئەوتۆی نەبووە بڵاوبێتەوە و ببێتە ڕەوتێکی سەپاوی بیرکردنەوە لەناو گەنج و قوتابیاندا یان لەناو جەماوەردا، چونکە لە بازنەیەکی بچووک زیاتر - کە بازنەی ڕۆحی پاکی شاعیرە - تێی نەپەڕاندووە.

شاعیری متصوف بۆ نموونە، سەرەڕای ئەم هوشیاری و ڕۆحە ڕاچەنیوەی خۆیشی، سەبارەت بە تەنیا باڵی و بێهێزی، بێدەنگیی هەڵبژاردووە. ئەمەش چونکە، بە بۆچوونی ئەو: دنیا هەر لە ئەزەلەوە و لە هەموو شوێنێک ئەم زوڵم و ستەمەی تێدا هەبووە و بێهوودەیە بیر لە هیچ ریفۆرمێک بکەینەوە:

شوکر هوشیارە مەحوی تێدەگا دنیا خەراباتە
کە بەدمەستی بکا ئەهلی، خەراپەی بۆچی لێ بگرم؟

کەواتە، لە چەند شیعرێکی چەند شاعیرێکی وەک ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بەملاوە، شیعری تەصەوف نموونەیەکی هوشیارییە کە توخم و بنچینەکانی یاخیبوونی تێدا هەبێت، بەڵام بەداخەوە دەبینین ئەم تەصەوفەش هەر لەپێناو خۆویرانکردن و سەرکوتکردنەوەی تاکەکەسی یاخییە، لەپێناو بەربادکردنی وزەی نەوجەوان و گەنجانەیە.

هەندێ لە شاعیرانی دیکەی مەزنی وەک نالی ش(١٧٩٧- ١٨٥٥) دەبینین (بەپێچەوانەی مەحوی کە سەری لە ئاسمانەکاندا دەسووڕێتەوە) سەریان لەناو واقیعدایە و شاعیرێکی زەمینین، بەڵام ئەمانیش دیدیان لە زوڵفی یار و دوگمەی سینە و باخی سێوان زیاتر تێپەڕ ناکا.

بەکورتی: هیچ نووسەرێکی ئەو زەمانە کلاسیکە ناوەڕۆکی ئەو جەنگەمان بەشێوەیەکی باریکبینانە بۆ دەرناخا کە ئەگەر لەنێوان نەسلی کۆن و نەسلی نوێدا هەبووبێت. ئەمەش لەوانەیە وا لێک بدرێتەوە کە دیارە خودی ئەم ململانێیە بوونی نەبووە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە نەسلی گەنج و قوتابی - کە حاجی بە شێر ناویان دەبا - هەمیشە «لە گوێی گادا نوستوو» نەیتوانیوە بزانێت چۆن بوێرێت هەستێتەوە. ئەمەتا حاجی کۆیی دیسان هۆیەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ دەسەڵاتدارانی کورد و دەڵێ:

لە عەهدی (کەرنەبی) تا دەوری (گاکوێر)
لە گوێی گا نوستوون زۆر حەیفە بۆ شێر

هێزی دەسەڵاتداری پیر (کەرنەبی و گاکوێر)، واتە هێزی مەلا و ئاغا و موفتییەکان، هێندە زاڵم و توندوتۆڵ بووە کە توانیویەتی بەتەواوەتی لغاوی نەسلە نوێیە بکات و لێ نەگەڕێت «ئەم شێرە» بتوانێت هیچ جووڵەیەک بکات.



# ئەمەل نەخلی هەمیشە سەوزە ئەمما بۆ ئەسەر دەڕوا..

حەمدی

لە سەدەکانی ڕابردوودا هیچ یاخیبوونێکی گەنجانە و ڕاپەڕینێکی خوێندکارانە دژی نەسلی کۆن و سیستەمە مەعریفیە حوجرەییەکە نەکراوە. بۆچی؟

هۆیەکە تەنێ ئەوە نەبووە کە دەسەڵاتدارانی حوجرە و دیوەخان زۆر توندوتیژانە و بەهۆی دینەوە فەقێکانیان بەستبۆوە، تەنێ ئەوەش نەبووە کە هیچ هوشیارییەک لە نێوەندەکەدا بەوەڵەد نەهات و- تەنانەت لەلایەن خودی شاعیرە یاخیگەرەکانیشەوە تەصەوف بە کەڵکی هیچ نەهات. ئەمانەمان هەمووی باس کرد، بەڵام چەند هۆکارێکی دیکەش هەن پێویستە لێرەدا خەتیان بەژێردا بهێنین کە ڕۆڵیان هەبوو لەوەی کە زوڵمی حوجرە و ستەمی دیوەخان تەمەنێکی ئەوەندە دوور و درێژیان هەبێت.
ئەو دەسەڵاتە پیرەی، کە زۆڵم و زۆرییەکانی، بەدرێژایی سەدەکانی هەشتەم و نۆیەم بە ناوەڕاستی سەدەکانی چواردە و پازدەشدا دەڕوات و تا کۆتایی سەدەی نۆزدەمیش هەر بەردەوام نەوجەوان و قوتابییان دەچەوسێنێتەوە و کەسیش لە گوڵ کاڵتری پێ ناڵێت، هەروەها ئەو خامۆشی و بێدەنگی و ڕاهاتن بەم زوڵم و زۆرە، هۆیەکەی چیە؟

ئەگەر بەراوردێک لەنێوان کوردستان و ئەورووپا بکەین، دەبینین ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست و سەدەکانی هەژدە و نۆزدە لێوانلێون لە ڕاپەڕین و یاخیبوون و ریفۆرم و شۆڕش و ڕووداوی هەژەندی ئەوتۆ کە نەک وڵاتێکیان گۆڕی بەڵکو کاریان کردە سەر وڵاتی دراوسێ و هەموو ئەورووپاش.. کەچی لە کوردستان، بەدرێژایی ئەو هەموو سەدە و ساڵە تاریکانە، لە بێدەنگی زیاتر هیچ نابینین. ئەمە بۆچی؟ ئایا لەبەرچی هیچ یاخیبوونێکی گەنجانە یان ڕاپەڕینێکی خوێندکارانە سەری هەڵنەدا؟

ئاخۆ هۆیەکە لەوەدایە کە گەنج و خوێندکاری کورد زیاتر لە غەمی ڕزگاربوونی نەتەوەییدا بوون و نەدەپرژانە سەر یاخیبوون دژی مەلا و میرە هاونەتەوەکانی خۆیان؟ ئایا بیری ناسوونالیزم (نەتەوەپەروەری) کۆسپ بوو لەبەردەم بەڕاستگەڕانی ئەم یاخیبوون و ڕاپەڕینە ئەنجام نەدراوانە؟

بە بۆچوونی من: جگە لەم هۆیانە - کەدوواتر دێینەوە سەریان - سۆنگەی دیمۆگرافی و گوندنشینی و کۆمەڵایەتی بەربەستی زۆر ئەستوور بوونە لەبەردەم هەڵگیرسانی ئەو ڕاپەڕین و یاخیبوونانەی پێویست وابوو بکرێن.

بۆ نموونە کاتێ شاری پاریس لە سەدەکانی چواردە و پازدەمدا ڕاپەڕی، ژمارەی دانیشتووانەکەی ( ۲۰۰۰۰۰ ) کەس بوو و ئەوکاتە پاریس تاقە پایتەختێکی هەرە گەورەی هەموو ئەوڕووپا بوو. ئەوکاتە پاریس دەمێک بوو ببوو بە شار، هەر بۆیەش یەکەمین جار ڕاپەڕین لەوێدا دەستی پێکرد. لەوانەیە یەکێک لە هۆکارەکانی ئەوەیش کە شۆڕشی فەڕەنسا (۱۷۸۷) و شۆڕشی کۆموونە ( ۱۸۷۰ ) هەر لە پاریسەوە دەستی پێکرد، هەمان هۆکاری دیمۆگرافی و کۆمەڵایەتی و شارنشینی ڕۆڵی هەبووبێت.

کەواتە شارنشینی Urbanisation ڕۆڵی هەیە لە زەمینە خۆشکردن بۆ یاخیبوون و ڕاپەڕینەکان. ڕاستییەکەیشی هەر وایە، ڕاپەڕین و یاخیبوونەکان لەو کاتانەوە دەستیان پێکردووە کە شارۆچکەکان وردە وردە دەستیان کردووە بە گەشەسەندن و بوونەتە شار.

لە کوردستانی سەدەکانی ڕابردوودا، تا کۆتایی سەدەی نۆزدەمیش، بەپێی ئەو سەرژمێری و پیشاندانانەی ئەولیا چەلەبی و گەڕالە ئەورووپاییەکان کردوویانە: هیچ شارێکی کوردستان نەبووە ژمارەی دانیشتووانەکەی لە سێ هەزار کەس تێپەڕ بکات. هەزاران گوند و لادێ، سەدان قەزا، دەیان ناحیە و شارۆچکە هەبوونە. هەر یەکێک لەوانە عەشیرەتێک، بنەماڵەیەک یان تیرە و خێڵێک تێیدا جێنشین مەژوولی کشتوکاڵ و زەوی و ئاودێری و مەڕومالات و ڕەز و باغی خۆیان بوونە و بێ

خەبەر لە گوندێکی ئەولاتریان: هەمووشیان یەکانگیر خزمی یەکتر لەژێر سێبەری ئاغای خۆیان سوێندیان بە سەری یەکتر و ئاغای خۆیان خواردووە؛ بەدەگمەن ڕێک کەوتووە مسکێن و وەرزێرێک یاخی ببێت و لە قسەی ئاغای خۆی دەرچووبێت: ئیتر چ جای موستەعیدێک یان فەقێیەک بۆنەوەی پێی بگوترێ «دەمڕووت» و شاربەدەر بکرێت!

ئەگەر شار لە کوردستاندا دروست نەبووبێت: هۆیەکەی ئەوە بووە کە ئەو زەوییەی لە گوند کێڵدراوە، ئەو ڕەز و بژوێن و لەوەڕگا و باغانەی سوودیان لێ دیتراوە زۆر شیرین و ئازیز بوونە، نەکراوە بەجێ بهێڵدرێن لەپێناو هیچ: لەپێناو شار!

جگە لەمەش پەیوەندیی خێڵەکی و تیرەپەرستی لەنێو گونددا زۆر زۆر بەهێز بووە. هیچ هۆ و ئامانجێک بە هیچ شێوەیەک نەیتوانیوە ببێتە پاساوی ئەوەی کە فەقێیەک یان موستەعیدێک بڕواتە شارۆچکەیەکی لە شارۆچکەکەی خۆی گەورەتر؛ یان ببێتە هەنجەتی ئەوەی کە جوتیارێک بچێتە گوندێکی لە گوندەکەی خۆی گەورەتر. پەیوەندییە بنەماڵەییە گەرم و عەشیرەتگەرییە توندوتۆڵەکەش ڕێگەی نەداوەتە هیچ کەسێک (ئەگەر گەنج ئەگەر پیر، ئەگەر ژن ئەگەر پیاو، ئەگەر مەلا ئەگەر فەقێ) لە ناوچەکەی خۆی دووربکەوێتەوە: مەگەر زۆر بەدەگمەن مەلایەک لەپێناو خوێندنی زیاتر چووبێتە شارۆچکەیەکی لەوەی خۆی گەورەتر یان لەکاتی ژنهەڵگرتندا.

بەم شێوەیە، پێویستە چاوەڕێی ئەوە بکەین کە سەبارەت بە هەر هۆیەک بووبێت خەڵک وردە وردە لە گوند و لادێکانەوە بەرەو شارۆچکەکان کۆچ بکەن (بۆ نموونە وەک ئەوەی کە خەڵک لە سنە و شارەزوور و هەڵەبجە و قەڵاچوالان و شوێنەکانی دیکەوە بەرەو شارۆچکەی سلێمانی کۆچیان کرد و سلێمانییان دامەزراند!).. پێویستە چاوەڕێی ئەوە بکەین کە - لە ئەنجامی کۆچی خەڵک لە گوند و لادێکانەوە- چەند شارۆچکەیەکی کوردستان وردە وردە گەشە بستێنن تا لە سەدەی بیستەمدا دەگەنە ئاستی شار.

بەپێی سەفەرنامەکەی مستەر ریچ: هەولێر لە ساڵی ١٨٣٢دا تەنێ قەڵاتێک بووە لە ناوەڕاستی دەشتێکی چۆڵ و هۆڵدا، بەڵام دووای کۆچکردنی خەڵکی گوندەکانی کرمانجەتی «عەلیاوە، عەوێنە، باداوە..» هەروەها دووای کۆچکردنی عەشیرەتەکانی مەنتک، دزەیی، گەردی، خەیلانی و خۆشناو بەرەو هەولێر، لە ساڵانی ١٩٤٠ بەملاوە، هەولێر ئیتر گەیشتە ئەوەی خاسیەتەکانی شار دروست بکات و دیمۆگرافیای بەرزتر ببێتەوە و پێکهاتەیەکی یەکگرتووی نوێ بەخۆیەوە ببینێت: بەشێوەیەک کە تاکەکەس ئیتر لەژێر فەرمایشتی ئاغادا نەمێنێتەوە، چیتریش هێندە پابەندی مەرج و نەریت و ئیلتیزامەکانی عەشیرەت نەبێت.

لێرە بەدوواوە تاکەکەسی کورد لە دەروەستبوونی بۆ ئاغا و مەلا و مزگەوت و عەشیرەت دابڕا، کەوتە ناو چەند پەیوەندییەکی نوێوە: پەیوەندیی لەگەڵ مودیری فەرمانگە، قوتابخانە، وەزارەت، زانکۆ، کارگەکان. ئەم دەزگایانەش وەک دەزانین شێوازێکی دیکەی پەیوەندین: ترس و پیرۆزییان (وەک عەشیرەت) تێدا نیە، نەرمترن، زیاتر سەربەستییان تێدایە، زیاتر بواری گفتوگۆ و بیرکردنەوەیان تێدایە. هەر ئینسانێک دەتوانێ -ئەگەر خۆی بیەوێت- تێیاندا ئازاد ڕەفتاربکات و ئازادانە بیر بکاتەوە، تەنانەت لە کاتی ناڕازی بووندا ناڕەزاییش دەرببڕێت یان بچێت لە جێگەیەکی باشتر و بەسوودتر کاربکات.

ئەم ئازادییەش لەناو شاردا (لەناو زانکۆ و فەرمانگە و کارگە و وەزارەتەکاندا) وەک دەزانین، یەکەمین هەنگاوە بەرەو «خۆڕێکخستن». ئەم ئازادییە، لەناو زانکۆ و فەرمانگە و کارگە و وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتییەکاندا، لە کاتی ئازار و چەوسانەوە و زوڵمدا بە هیچ شێوەیەک ڕێگەت لێ ناگرێت، بەڵکو هانیشت دەدات کە لەسەرەتادا «هاوارێک» بکەیت: «هاوار» کە دەسپێکردن و سەرەتای هەموو یاخیبوونێک و ڕاپەڕینێکە..

کەواتە، مەتەڵێک هەڵناهێنین ئەگەر بڵێین: شاری گەورە لە سەرەتادا لە دەرەوەی سنووری کوردستاندا دروست بوونە: ئەستەمبۆڵ، قاهیرە، بەغدا، تاران، دیمەشق. بەتایبەتیش ئەستەمبۆڵ، چونکە یەکەمین ئەو شوێنانەیە کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە سیفەتی شار وەردەگرێت و پاشان دەیان نووسەری یاخی و نەسلێکی ڕاچەنیوی گەنجی کورد دروست دەکات. حاجی لە مەتحی ئەستەمبۆڵدا دەڵێ:

سەوادی ئەعزەمی قوستەنتەنییە
گەلێ بێ ناوی کردە صەدری ئەعزەم

دووای دامەزرانی ئەستەمبۆڵ ئنجا وردە وردە شارۆچکەکانی وەک سنە و سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و دیاربەکر و بەتلیس و مەهاباد گەشەیان سەند و بوونە شار.

لە سۆنگەی هەموو ئەو شتانەی باسمان کردن، هیچ سەیر نیە، کەواتە، ئەگەر دەبینین یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی (کە وەک یاخیبوون و ڕاپەڕینێکە) لە شارێکی گەورەی پایتەختی وەک قاهیرە سەری هەڵداوە، یەکەمین گۆڤاری کوردی لە پایتەختێکی وەک ئەستەمبۆڵ بڵاوکراوەتەوە، هەروەها یەکەمین قوتابخانە مۆدێرن ١٩٠٨ و ڕێکخراوە خوێندکارییەکانیش ١٩١٢ و یەکەمین ڕێکخراوەکانی ژنان ١٩١٩ و ئەوانی ڕووناکبیرانیش ١٩٠٨ (کە یاخیبوون و ڕاپەڕینێکن) دیسان هەر لە ئەستتەمبۆڵی پایتەختدا سەریانهەڵداوە.

بەم شێوەیە، دەبینین تەنیا لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوەیە کە شار لە کوردستاندا دروست دەبێت: تەنیا لەو کاتەشەوەیە کە زۆرانبازی لەنێوان نەوەکاندا Conflit des Generations بەشێوەیەکی دیار و توند و تۆمارکراو لە کوردستاندا سەرهەڵدەدات؛ بەشێوەیەک کە وەک هوشیارییەک دەنووسرێتەوە، وەک ڕاپەڕینێکی گەنجانە و خوێندکارانەش خۆی دەسەلمێنێت.

# پێشکەوتن بەرەو دوواوە:

# مردنی تاکەکەس

مانەوە لەشێوەی دێهات و گوند و شارۆچکەدا، واتە نەبوونی شار یان دروست نەبوونی شار، بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو، هۆکارێکی دیکەی دروست نەبوونی ڕاپەڕینی خوێندکارانە و گەنجانە بووە. ئەمەش چونکە لەو کاتەوەی شار دروست دەبێ پەیوەندییە عەشایەرییەکان هەڵدەوەشێنەوە و قەدری هۆز و عەشیرەت هێندە نامێنێ؛ ئینتیما بۆ عەشیرەت و بەگوێکردنی سەرۆک هۆز کەم دەبێتەوە. ئاوا ئیتر لێرەوە ئازادی و ئازادیی تاکەکەس و سەرەتاکانی دەربڕینی ناڕەزایی دەست پێ دەکەن..

شار، چونکە، قەرەباڵغییە و هەرایە و تێکەڵەی هەموو عەشیرەت و چین و توێژێکی جۆراوجۆری ئەو خەڵکەیە لەدەست ئاغا و مەلا و عەشیرەت قوتاریان بووە: ئینسان لەوێدا وای لێ دێت زۆرتر و زیاتر بیر لە «خودی خۆی» بکاتەوە، وای لێ دێ بتوانێ بوێرێت یاخی ببێت و داوای ئازادی و مافەکانی خۆی بکات.

پێشتر ئاماژەیەکمان بۆ ئەوە کرد کە جاران لە کوردستاندا شار نەبووە بۆئەوەی یاخیبوون و ڕاپەڕینی تێدا ئەنجام بدرێ، ئیدی بۆیە ستەم و کۆیلەبوونەکەی قوتابی و گەنج درێژەی داوە؛ بەڵام ئەمڕۆ چەند شارێک هەن.

ئەم شار پەیدابوونەش لە کوردستاندا دەبووایە بەتەواوەتی هانی ئەوە بدات کە نزیک بکەوینەوە لە ڕاپەڕین و یاخیبوونەکان، بەڵام ئەدی بۆچی ئەمە ڕووی نەداوە؟ شار هەیە و ڕاپەڕین نیە! بۆچی؟

بە تێگەیشتنی من، بەپێ ئەو تایبەتمەندییانەی دۆخی کوردستان، ئەمە سێ هۆکاری هەیە:

١- لە ١٩٩١ بەملاوە، ئەوەی پێی دەڵێن «ئەمنی قەومیی کورد» ڕێگرێکی ئەستوور بووە لەبەردەم ڕاپەڕین و یاخیبوونەکانی گەنج و خوێندکاران. (قوتابیان و لاوان پێیان وایە: هەر بشێوی و هەرایەک لە کوردستاندا لەوانەیە بێتە هۆی لەدەستچوونی دەسکەوتە نیشتیمانییەکانمان و تێکچوونی حکوومەتە ساواکەمان!).

٢- پێکهاتەی کۆمەڵایەتییانەی شارەکانمان تا ئێستاش پێکهاتەیەکی سست و لاواز بووە بۆ دروستبوونی ڕاپەڕینی گەنج و قوتابیان. پێکهاتەیەکی ئەوتۆ بووە کە «لەئەنجامی هێشتا گوندمانەوەی شاردا» تاکەکەس حەیران و سەرسوڕماو ماوەتەوە: ئایا ئینتیما بکات بۆ (حزب، خێزان، عەشیرەت..) یان ئینتیما بۆ خودی خۆی؟

تاکەکەس لە کوردستان لە شاریشە بەڵام هەر پابەندە بە گوند و عەشیرەت، یان لەڕێگەی سلووکی عەشایەرییەوە، باری خێڵەکیی خۆی توند توند پاراستووە. تەنانەت هەندێکیان هەموو پێکەوە لە یەک شوێنی دیاریکراوی شاردا نیشتەجێ دەبن. بەم حاڵەش شار دروست نابێ: چونکە لەناو یەک بۆتەی یەکانگیری خاوەن یەک بەرژەوەندیی هاوبەشدا ناتوێنەوە. بۆیە دەبینین، بە زاهیر، ڕێسای عەشایەری و نەریتی کۆن تەواو بووە، بەڵام هی نوێ دروست نەبووە؛ نەیتوانیوە بێ بگات. ئەمەیە خاسیەتی شاری ئێمە کە ناتگەیەنێتە یاخیبوونە گەنجانەکان..

ئەمە لەکاتێکدا لە ئەورووپا شارسازی سپێردراوەتە دەست پسپۆڕ و ئەندازیار و هونەرمەندانی هونەرە تەجەسومییەکان، بەپێی پلان و بەرنامە شار دروست دەکرێت نەک خۆبەخۆ و لەخۆڕا.

لە شارێکی گەورەی بۆ نموونە وەک هەولێردا، ئەگەرچی عەشیرەتەکان (بۆ نموونە مەنتک و خەیلانی و سوورچی .. هیی تریش) بەخۆیان و مانگا و پزدێن و دەمانچە و تەسبیح و خەنجەر و مەڕومالاتەکانیانەوە هاتوونەتە ناو ئەم پایتەختە تێکەڵ و پێکەڵە؛ -ئەگەرچی لەناو شاریشدا دەژین- بەڵام لەناو شارەکەشدا دیسان گەڕەکێکی سەربەخۆیان تەنیا بۆ خۆیان

دروستکردووه و هەر هەموویان (وەک ئەوەی گوندەکەی خۆیانیان گواستبێتەوە ناو هەولێر) پێکەوە، بە هەمان هەستی عەشایەری و نەریتی خۆیانەوە دەژین: هەندێکیان خاڵ و مامۆزا و کوڕ و کچەکانیان لە دەزگا و زانکۆ و وەزارەت و دائیرەکانیشن! ئەم خەڵکە گوندییە عەشایەرییانەی ناو شار، نەک هەر ناچنە ژێر باری هەولێرییە ئەسڵ و شارستانەکانەوە بەڵکو توانیویانە کار لە ئەخلاق و نەریت و بیرکردنەوەی ئەمانیش بکەن و سیستەمێکی عەشارییانە و بیرکردنەوەیەکی خێڵەکی لەناو شارەکەدا بچێنن، ئەمەش ئۆتۆماتیکیانە دژ بە بیرکردنەوەی تاکەکەسی و ئازادییە تاکەکەسییەکانە! ئەمە مانای وایە، بەشێکی زۆری خەڵک لەناو شاریشدایە، بەڵام بە عەقڵی عەشیرەت و گوند بەڕێوە دەچێ؛ لەژێر ڕەحمەتی خەنجەری خاڵ و کلاشنکۆفی مام و چاوسوورکردنەوەی باوکیدا دەژیت!

کەواتە، ئەو بۆچوونەی ژان پۆڵ سارتەری فەرەنسی ڕاستە کە دەڵێ (هەمووی تاکەکەس لە خەڵکەوە دێت). ئەمەش مانای وایە تاکەکەسی کورد، ڕاستە: ئازادنەبوونی، یاخی نەبوونی، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پابەندبوونی بە «خەڵک»، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خۆبەستنەوەی بە نەریتەکانی عەشیرەت و پیر و مامۆستا و میر یان حیزب، ئەو نەریتانەی توندتر لە حوکمی مزگەوتێک پەلوپۆیان بەستۆتەوە.

شار واتە دەربازبوون لە هەموو کۆت و پەیوەندییەکانی عەشیرەت و بنەماڵە و مزگەوت و فیۆدالیزم، کەچی لە کوردستان شار هەمان ئەو گوندەی جارانە کە هەمان ئەو دەسەڵاتانەی پێشوو تێیدا دەسترۆن بەڵام لە فۆرمی مۆدێرندا. ئەمەش وادەکات کە تاکەکەس و قوتابی و گەنجی ئەمڕۆ -لەنێوان ئەو دوو بەرداشەدا: بۆ نموونە لەنێوان مزگەوت و ئەنتەرنێتدا، لەنێوان دیوەخان و سەتەلایتدا، لەنێوان حوجرە زانکۆدا- تووشی سەرسوڕمانی و پاشاگەردانی و سەرلێشێوان بن!

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە دووفاقییەک بدەین کە لە بیرکردنەوەی تاکەکەس و ڕۆشنبیریی ئازادیخوازانەی گەنجی کورددا هەیە: «ئەو» دەیەوێ ئازادیش بێت و لەدەست هیچ نەریتێکیش خۆی ڕانەپسکێنێ؛ «ئەو» دەیەوێ ئازادیش بژیت و دڵی سەرۆک عەشیرەت یان پیر یان حیزب یان مامۆستاکەی خۆیشی نەیەشێنێ، هیچ باجێکیش نەدات. هەمووشمان دەزانین: کاتێ تاکەکەس (گەنج، خوێندکار..) دەیەوێ یاخی ببێت و ڕاپەڕێ؛ نابێت پێویستی بە ڕاوێژکردن لەگەڵ هیچ سەرۆک عەشیرەت و حیزب و مامۆستا و باوباپیرانێک بێنێ!

کەواتە، تاکەکەسی ئەمڕۆی کوردستان تا ئەمڕۆش، بە هێزە مێژوویی و سیاسی و دینی و عەشیرەتگەرییەکان بەڕێوە دەچێت.

٣- بەم شێوەیە، دروست نەبوونی بیری تاکگەرایی Individualis-me لە کۆمەڵکەی کوردیی ئەمڕۆدا، یان دەسترۆیی سیستەمی عەشایەری و حیزبی و باوکسالاری بەسەر توێژی قوتابی و گەنجاندا، هەم لە ژینگەکەیەوە هەم تا ڕادەیەک لە خۆیشیدا، هۆکارێکی دیکەیە بۆ بەردەوام بەردەوام قبووڵکردنی ئەم ستەم و کۆیلەییە و یاخی نەبوونیان..

کولتووری کوردی کولتوورێکی کۆللێکتیڤە. سەرچاوەکانی ئەم کولتوورە بریتین لە سەرچاوەگەلێکی دەستەجەمعی، نەک تاکەکەسی. تەنانەت وای لێهاتووە هەندێ لە دیاردەکانی ئەم کولتوورە کۆللێکتیڤە بوونەتە تابوو.

حەیف: تاکەکەس لە وڵاتی ئێمەدا نەبۆتە هێزێک کە بتوانێ خۆی لە نەریت و کۆسپەکان بتەکێنێتەوە، نەبۆتە ئایدیۆلۆژیایەک یان شێوازێکی ژیان بەڵکو تەنیا شێوازێکی بوونە (وەک مەلایەک، وەک بەقاڵێک..)؛ خۆی نەگەیاندۆتە ئەو ئاستەی بتوانێ شێوازێکی شۆڕشگێڕانە و یاخیگەرانە بێت لەناو ژیانەکەدا، بەڵکو بوونێکی ئاسایی ڕۆتین و باوە (ژمارەیەکی ئاساییە لەناو ژمارەکاندا). بۆیەش عادەتەن هەموو تاکەکان لەیەکتر دەچن و کەسیش مەترسی بۆ سەر هیچ شتێک دروست ناکات.

مەسەلەکە پەیوەندیی بەوەشەوە هەیە کە ئێمە هیچ کولتوورێکی یاخیبوون و هیچ مێژوویەکی بیرکردنەوەی تاکەکەسیانەشمان نیە. هەموومان دەزانین: مەسەلەی ئازادیی تاکەکەس، بەدرێژایی ئەو هەموو سەدە و سالانەی کە کورد دەخوا و دەکا و بیردەکاتەوە و دەنووسێ، بەداخەوە، نەبۆتە مەراق و خەمی هیچ نووسەر و ڕۆشنبیرێک. ئەگەر لەولاوە شاعیرێک یان نووسەرێک سەرەدێڕێکی لەبارەی (داری ئازادی) یان لەبارەی «ئەی ڕەقیب» و ڕاپەڕینەوە نووسیبێ ئەوا بەمە مەبەستێکی نەتەوەپەروەریی هەبووە، واتە مەبەستی: دیسان ڕاکێشانەوەی تاکەکەس بووە بۆ ناو کۆمەڵ (نیتشە گۆتەنی: بۆ ناو مێگەلەکە). بەم شێوەیە، پێشکەوتنەکەی تاکەکەسی کورد لە ڕەوتی مێژوویی خۆیدا پێشکەوتنێک بووە بەرەو دوواوە.

بەم شێوەیە، تاکەکەسی کورد، لەئەنجامی «گەڕانەوە بەرەو نەتەوە» و لەئاکامی خۆبەختکردن لەپێناو (وڵات/کۆمەڵ)دا، هەموو دەم، بەدرێژایی سەدە ڕابردووەکان و تائێستاش، بۆتە داشی ئەو دامەیەی کە «ڕێبەرە دامەزانەکان» بەپێ فەندی گەمەکە جێگۆڕکێیان پێی کردووە و «بەردەکەش» واتە تاکەکەس، ئێستاشی دەگەڵدا بێ، هەستی بە خودی خۆی و جێگۆڕکێیەکە نەکردووە.

لێرەوە، پێویستبوونی ڕەهایی تاکەکەس و خۆڕاتەکاندنی تاکەکەس لەدەست حیزب و نەتەوە و خێزان و عەشیرەت و نەریتەکان، بۆ تاکەکەسی کورد، بایەخێکی زۆر گرنگی هەیە: تاقە ڕێگایەکە بەرەو ئازادییە ئازادەکان و داهاتووە نوقلانەبەخشەکان.

لەم بارەیەوە، ئەوەڵین و تاکە بیرمەندێکی کورد، کە لە ماوەی بیست و پێنج سالی کۆتایی سەدەی بیستەمدا ڕچەی بیرکردنەوەی هەموانی و نەریتەکانی شکاند و ئالای بیری ئازادی تاکەکەسیانەی بەرزکردەوە، مەسعوود محەممەد بوو، ئەوەتا لە (مرۆڤ و دەوروبەر)دا دەڵێ:

لە دەمێکەوە کەوتوومەتە سەر ڕەهابوون لە سیحری قسەی براگەورە و پێشەوا و قسەڕۆیشتووان: چونکە لە چەند تەجرەبەی مام سافیلکەوە دەروونبەتاڵیی ژمارەیەک لەو سەرامەدانەم بۆ ڕوون بۆوە؛ بێ ئومێد بووم لە زۆربەی هەرە زۆریان کە بتوانن ڕەها بن لەو کۆتە فیکرییەی پێیەوە قاڵب بەندن..



## ئەم دەستە کە چوو دەستەیەکی تازەیە دێ
## مەعلووم نەبوو ئەم کەشمەکەشە کەی دەبڕێ

حاجی

ستەم و چەوساندنەوە و بەکۆیلەکردنی قوتابیان و لاوان، بەدرێژایی سەدەکان، بەردەوام بووە. وانیە؟

- وایە.

- باشە، کەچی ئێستاش ئەم ستەم و کۆیلەکردنەی خوێندکار و گەنج، هەر هەیە و بەردەوامە. ئەمە چۆن لێک دەدرێتەوە؟ جیاوازیی دۆخی جاران و ئەمڕۆ لەچیدایە؟

لە سەرەتادا، بۆئەوەی خوێنەر لێم چەواشە نەبێت و کەسیش واتێنەگات من لە قسەکانمدا بەسەهوو چوویمە، دووپاتی ئەوە دەکەمەوە کە من لەم کتێبەمدا تەنێ باسی یاخیبوونی گەنج و ڕاپەڕینی خوێندکارانە، واتە باسی زۆرانبازیی نێوان نەوەکان Conflit des Generations دەکەم؛ کارم بەوە نەبووە و نیە کە تۆژینەوە لەبارەی ئەو یاخیبوونە چەکدار و ڕاپەڕینە خوێناویانە - بنووسم کە لە میرنشینە کوردییەکانەوە و لەلایەن سەرگەڤازی عەشیرەتە کوردەکانەوە سەرۆکایەتی کراوە و پاشان خاسیەتێکی ناسیوونالیستانە و کوردایەتیانەی (نالێم کوردستانیانەی) وەرگرتووە.

ئەم تێبینی و بیرخستنەوەیەشم بۆیە خستەڕوو، بۆئەوەی بلێم: ئەسڵەن هەر هەمان ئەم ڕۆحیاتی میرپەرستی و عەشیرەتگەرییەش بووە (لەناو میرنشینە کوردییەکاندا: بۆ نموونە لە چوارچێوەی میرنشینی بابان و ئەردەڵان و بەدرخان.. کە خاسیەتێکی ناسیوونالیستانەی وەرگرتووە) بۆتە ڕێگر و کۆسپێک لەبەردەم گەنج و خوێندکاران لەوەی کە لەڕووی میر و سەرۆک عەشرەتە کوردەکانی خۆیان ڕانەوەستنەوە و بەڕوویاندا هەڵنەشاخێن.

کەواتە، ڕۆحیاتی میرپەرستی و عەشیرەتگەری لە کوردستاندا (بەهۆی ئەوەی خاسیەتێکی مەیلەو کوردایەتیانەی لەلای گەنج و قوتابیی کورد دروستکردبوو) بەدرێژایی سەدەکان هۆکارێکی دیکەی دوواخستنی ڕاپەڕینی خوێندکارانە و یاخیبوونی گەنجانە بووە لە کوردستاندا. ئەمەش چونکە، گەنج و قوتابیانی کورد، پێیان ئەسەف بووە لە دژی میرێکی کورد، لە دژی دەسەڵاتداریتیی میرنشینێکی کورد ڕاپەڕن، یان بێن ئاژاوەیەک -سەبارەت بە هەر یاخیبوونێکی خۆیان- لە چوارچێوەی شارۆچکەیەکی خۆیاندا بنێنەوە و دڵی دوژمنی خۆیانی پێ خۆش بکەن و زیان بگەیەنن بەم میرنشینە «نەتەوەییە». هەرچەند خۆ ئەو دوژمنە (ئەگەر سوڵتانی عوسمانی، یان پاشای ئێران) لەکۆتاییدا هەر دەشیتوانی، بە یارمەتیی میرە کوردەکە و دەزگاکانی ئەو میرنشینە کوردییە، ڕاپەڕینەکە کپ بکاتەوە.

ئەم ڕێز و ملکەچییەی فەقێ و موستەعید و تەنانەت شاعیرە گەنجە یاخییەکان (بۆ نموونە حاجی و خانی و نالی) بۆ میرنشین و میرە کوردەکان، وا پێدەچی -بەداخەوە- هەرگیز نەبۆتە مایەی ئەوەی کە ئەمانیش (سەرۆک هۆز و میرە کوردەکان) لە پاداشتی ئەوەدا پشتی یەکتر بگرن و خۆیان تەرخان بکەن بۆ خزمەتی گەنج و سەربەخۆیی و ریفۆرم لە ژیانی قوتابی و گەنجەکاندا. لەم بارەوە ئەحمەدی خانی باش توانیویەتی ڕەخنە لەم میرە کوردە فیۆدالانە بگرێت کە چۆن لەناو عەیش و نۆشی خۆیاندا هەمیشە ڕێگر بوونە لە بەردەم پێشکەوتنی گەنج و قوتابیی کورد:

گەر دێ هەببوبا مە ئیتیفاقەک
ڤێکڕا بکرا مە ئینقیادەک
ڕۆم و عەجەم و عەرەب تەمامی
هەمیان ژ مەڕا دکر غەلامی
تەکمیل دکر مە دین و دەوڵەت
توحسیل دکر مە عیلم و حیکمەت

ئەم ڕۆحیاتی میرپەرستی و عەشیرەتگەرییەی لە سەدەکانی ڕابردووی کوردستاندا هەبووە و هۆکارێکی دوواخستنی ڕاپەڕینی خوێندکارانە و یاخیبوونی گەنجانە بووە، هەمان هۆکار - لە شێوەیەکی تازەی ناسیووونالیستیدا - لە کوردستانی ئەمڕۆشدا هەمان ڕۆڵی نێگەتیڤ دەبینێ. دەمەوێ بڵێم: ئەمڕۆش هەر ئەگەر مەترسیی دەوڵەتی ئێران و تورکیا و عێراق و سووریا نەبێت بۆ سەر «حکوومەتە ساواکەمان» ئەوا قوتابی و گەنج و نەسلی نوێی ڕووناکبیران ئەمڕۆ وزە و ئامادەیی تەواوی ئەوەیان هەیە یاخیبوونی خۆیان دەربڕن و بکەونە سەر پێ بۆ ڕاپەڕینێکی هاوچەرخی گۆڕانساز!

من واتێدەگەم قوتابی و گەنجی ئەمڕۆی کورد لەوە دەترسن کە هەر ڕاپەڕینێکی خوێندکارانە و گەنجانە و کۆمەڵایەتیانە ئەگەر دژی حکوومەتی هەرێم سازبکرێت، ئەوا دژی «ئەمنی قەومیی کورد» بکەوێتەوە: چونکە ڕاپەڕینێکی وەتۆ چەند قازانجی گەنج و قوتابی و نەسلی نوێی تێدا دەبێت، ئەوەندە و زیاتریش بە قازانجی دەوڵەتە دراوسێ - دوژمنەکانی کورد دەکەوێتەوە.

لە ئەمڕۆشدا و لە سەدەکانی ڕابردووشدا، گومان ستەم و کۆیلەکردنەکە هەر هەبووە و هەیە: بەڵام جیاوازیی ئەوەی ئەمڕۆ لەچاو ئەوەی دوێنێ لەوەدایە کە جاران هوشیاری لەبارەی ئەو زوڵم و ستەمە نەبووە، بەڵام ئەمڕۆ هوشیارییەکە گەیشتۆتە ئاستێکی دیار! ئەمەش بەئاشکرا لە ڕەوتی خۆڕێکخستن و بڵاوکردنەوەی گۆڤار ورۆژنامە خوێندکارییەکان و دامەزراندنی سەنتەرە کولتوورییەکاندا دەردەکەوێت.

جیاوازییەکی دیکەش لەوەدایە کە جاران یاخیبوون نەبووە (ئەگەر هەستێکی یاخیگەرانە هەشبووبێت ئەوا مازۆخیانە بووە و بەرەو ناوەوە - لەشێوەی تەصەوفدا- هەبووە) بەڵام ئەمڕۆ چەند هەوڵدانێک بەرەو یاخیبوونەکان هەن، بەرەو دەرەوە، بۆ سەر واقیع. ئەمەش جارێ تەنیا لە شێوەی مانگرتن و ڕێپێوان یان لە شێوەی خۆپیشاندان دەردەکەون.

لە هەموو ئەمانەش گرنگتر، سەرهەڵدانی شار و شارنشینی بوو کە سەبارەت بە کۆچ و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و هاتنەئارای پێکهاتەیەکی

نوێی کۆمەڵایەتییەوە سەری هەڵدا. لە شارنشینیشیدا (دەڤەری تایبەت) و و (دەڤەری هەموویی) لەیەکتر جوداکرانەوە. جاران منداڵ و ژن و گەورە.. هەموویان پێکەوە لە یەک دەڤەردا لەناو یەک جۆر پەیوەندیدا بوون. بەڵام لە شارنشینیدا هەر یەکەیان تایبەتمەندی و خاسیەتەکانی خۆیان لەیەکتر جودا کردەوە و هەر یەکەیان دەڤەری تایبەتی خۆی دروست کرد: ئەدەبی منداڵ دروست بوو، ئەدەبیاتی ئافرەتان سەری هەڵدا، ڕێکخراوە خوێندکارییەکان پەیدا بوون، سەندیکای ئەندازیاران و سەنتەری گەنجان و .. هتد. ئەمە لەکاتێکدا لە سەردەمی گوندنشینیدا یان لە گوندی کوردستاندا تا ئێستاش ئەم شتانە نین.

هەر لەئاکامی ئەم شارنشینییەدا توخمێکی بنچینەیی و کاریگەر لە ١٩١٩ بەملاوە هاتۆتە مەیدانەوە کە بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو بوونی نەبووە: بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو نوستبوو: ئەویش هێزی مێینەیە؛ ئافرەت.

هاتنە مەیدانی ئافرەت، کە یەکەمین ڕێکخراوی خۆیان (کورد قادین جەمعیەتی - کۆمەڵەی ئافرەتانی کورد) لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٩١٩ دامەزراند هێزێکی زیاتری بەخشییە ناوەڕۆکی ئەم هەستەی یاخیگەرایی و چۆنیەتییەکەی پتەوتر و بەهێزتر کرد. هێز و وزەبەکی دوو لایەنەی هەیە:

١- لەباری دیمۆگرافییەوە، بێگومان ژمارەی ئەوانەی زیاد کرد کە ئەکتیڤ و چالاکن لەم بەستێنەی خەباتی گەنجانە و خوێندکارانەدا. واتە لەباری چەندێتییەوە ژمارەی یاخیبووەکانی ڕوو لە زیادبوون دەکات: چونکە جاران وەک دەزانین هەر لە ماڵەوە دانیشتبوون.

٢- لەباری فیزیک و دەروونییەوە، بوونی ئافرەت لەناو کۆڕ و کۆمەڵە و چالاکییەکاندا، گوڕی نێر (گوڕی پیاوی گەنج و قوتابی) بەتینتر دەکات: بوونی ئافرەت شەوق و شۆڕ و زەوق و توانایەکی زیاتر دەداتە گەنج و خوێندکار لە ڕاپەڕین و یاخیبوون و چالاکییە کولتووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا.

بەم شێوەیە، ئێستا هەموو ئەم توخمە تازانە هەن و دەور دەبینن.

# یەکەمین خۆرێکخستنی گەنجانە و قوتابیانەی کورد
## ١٨٨٩-١٩١٢

لێرەدا کورتەیەک لە مێژوی ئەو سەرهەڵدانە رووناکبیرییەی گەنجان و ئەو یاخیبوونە خوێندکارییەی لاوانی کورد لە شاری ئەستەمبۆڵی پایتەختی عوسمانیدا دەخەینە روو کە چۆن رۆڵیان هەبووە لە دروستکردنی بزاڤێکی یاخیگەرانە و گەنجانە و ئازادیخواز لە هەمان کاتیشدا لە دروستکردنی بزاڤێکی کوردپەروانە (ناسیوونالیستانە).

رووخاندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەگەرێتەوە بۆ هێزی تەڵبە و گەنج؛ دەگەرێتەوە بۆ دوو گەنجی قوتابیی کورد لە ئەستەمبۆڵ:

د. عبداللە جەودەت و ئیسحاق سکووتی کە دوو گەنجی قوتابیی کورد بوون، بۆ خوێندن چووبوونە ئەستەمبۆڵ و لە کۆلێژی (پزیشکیی سەربازی) دەیانخوێند. لەوێ لە پۆلی دووەمەوە کەوتنە ژێر کاریگەرێتیی بیری پەرلەمانتاری و شۆرشی فەرەنسا و بیری رۆشنگەریی ئەوروپییەوە، ئیدی بریاریان دا حزبێک لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی دەستووری و فیدراڵی واتە لەرێگەی رووخاندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە دابمەزرێنن. بەم شێوەیە، لە بەرواری ٢١ی مایسی ١٨٨٩ لەگەڵ چەند قوتابییەکی دیکەی ئەرمەن و چەرکەس بریاری دامەزراندنی ئەم حزبەیان بە نهێنی دا و لەرۆژی ناوبراودا یەکەمین کۆبوونەوەی خۆیان بەست. بەم شێوەیە ئیتر ئەم بازنە رووناکبیرییە لەناو زانکۆدا و پاشان لەناو شاری ئەستەمبۆڵدا رۆژبەرۆژ و مانگ لەدووای مانگ فراوانتر دەبوو تا وای لێهات بووە بناغەی حزبی «ئیتیحاد و تەرەقی» و پتەوبوونی (تورکە گەنجەکان) لە هەموو تورکیای ئەو زەمانەدا.. تا لەکۆتاییدا ئیپراتۆریەتی عوسمانی بەهۆی ئەوانەوە رووخا.

شایانی باسە د. عبداللە جەودەت، رووناکبیر و شاعیر و وەرگێر و رۆژنامەنووس، خاوەنی یەکێک لە یەکەمین چاپخانەکانی سەردەمی

عوسمانی بە ناوی (ئیجتیهاد)، کوردی دیاربەکر بوو، بە تورکی و فارسی و عەرەبی و ئەرمەنی و ئینگلیزی و فەڕەنسی دەینووسی و تەرجەمەی دەکرد؛ دەیان کتێبی بەم زمانانە بڵاوکردۆتەوە. ڕۆڵێکی مەزنی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بیری یاخیگەرانە و گەنجانە و ئازادیخوازانەی کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا. کاریگەرییەکی زۆریشی نواند بەسەر عبدالرحمن بەدرخان و پیرەمێرد و ژەنەراڵ شەریف پاشا و ڕووناکبیرە گەنجەکانی دیکەی ئەوسای کورد. هەموو تەمەنی خۆی، لە ئاوارەییدا (لە ئەستەمبوڵ و لیبیا و ژنێف و پاریس و لەندەن) لەسەر بیری ئازادیخوازانە دانا و توانیی ببێتە بناغەیەک و سەرکردەیەکی ئەو شۆڕشە ڕووناکبیرییە گەنجانەیەی کە ناسراوە بە بزاڤی (گەنجە تورکەکان) و (گەنجە کوردەکان). ئەوەتا لە نامەشیعرێکیدا لە ۲ اغسطوس ۱۸۹۸، لە شاری ژنێفەوە -لە سویسرا- بۆ عبدالرحمن بەدرخانی سەرنووسەری یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی (کوردستان)ی نووسیوە دەڵێ:

ایام ما گذشت بغربت ولی چه غم
اشراق شرق شد اثر اغتراب ما

واتە:

ڕۆژەکانمان لە ئاوارەییدا بە هەدەر چوون، بەڵام چ باک
ڕۆژهەڵاتی سەرتاپا درەوشاندەوە ئاوارەییمان

ئەوەتا ئەمەیە هێزی قوتابی و گەنج! ئەو هێزە گەنجانە و خوێندکارییەی کە دەبێتە هۆی درەوشاندنەوەی هەموو ڕۆژهەڵات! ئەوەتا ئەو شۆڕشە ئازادیخوازەی کە ڕوخساری - جوگرافیای ڕۆژهەڵات دەگۆڕێت و ژیانی ڕۆژهەڵات دەگۆڕێت: لەلایەن قوتابییەکی گەنجی کوردەوە دەست پێدەکات و پاشان لەلایەن چەند گەنج و خوێندکار و ڕووناکبیرێکی گەنجی هاوڕێی خۆیەوە (لەناو ئەوانەدا چەند کوردێکیش: پیرەمێرد، میقداد - مەدحەت، عبدالرحمن بەدرخان، ئیسحاق سکووتی، ئەمین عالی بەدرخان..) پریشکی ئاگرەکەی دەکەوێتە ناو کوردستانیشەوە.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ژمارەیەکی زۆر نەوجەوان و قوتابی و لاوانی کورد، کە بە «گەنجە کوردەکان» ناسراون، لە هەر چوار پارچەکانی کوردستانەوە روویان کردبووە ئەستەمبۆڵ: محەمەد میهری و مستەفا شەوقی لە کوردستانی ئێرانەوە، مەمدووح سەلیم و هەمزە بەگ و سەعید کوردی و خەلیل خەیالی و د. عبداللە جەودەت و برایانی بەدرخان و قەدری جەمیل پاشا و ع. رەحمی هەکاری لە کوردستانی تورکیاوە، ئیسماعیل حەقی بابان و پیرەمێرد و مستەفا پاشا یامولکی و ئەمین زەکی بەگ و مەعرووف جیاووک و ئەمین فەیزی بەگ و ژەنەڕاڵ شەریف پاشا و زێوەر لە عیراقەوە.. ئەمە جگە لە نالی و حاجی قادری کۆیی و کەیفی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە لە پێش ئەم نەسلە گەنجەشەوە هەر لەوێ بوون.

گەلێک لەو خوێندکار و نووسەرە گەنجە کوردانە لە زانکۆکانی ئەنقەرە و ئەستەمبۆڵ و پایتەختەکانی ئەورووپا دەیانخوێند کە پاشان بڕوانامەی بەرزیان هێنایەوە؛ پیرەمێرد دەڵێ: «بە نیوە خوێندەواری لە سلێمانی دەرچووم و خوێندنێکی بەرزم هێنایەوە». یان بەلای کەمییەوە فێری زمانەکانی تورکی و فەرەنسی و ئەڵمانی و رووسی و یۆنانی و ئینگلیزی بوون. ئەو زمانە بێگانانەیان بەکاردەهێنا بۆ تازەکردنەوەی کولتووری کوردی و بەرەوپێشەوەبردنی دۆزی کورد.

ئەو نووسەر و قوتابی و گەنجە کوردانە بەشی هەرە زۆریان بە خواستی خۆیان پەرتەوازەی شاری ئەستەمبۆل، هەندێکی دیکەشیان ئاوارەی شاری ژنێف و پاریس ببوون. لەوێ- لە لایەکەوە لە ژێر کاریگەریتیی کولتووری ناسیۆنالیستی تورک و ئەرمەندا، لەلایەکی دیکەشەوە لە ژێر کاریگەریتیی راستەوخۆی کولتووری ئەورووپی، بەتایبەتی فەرەنسیدا- دەیانویست دوورەوڵاتبوونی خۆیان بکەنە تریبوونێک بۆ بووژاندنەوەی جموجۆڵی ناسیونالیستی کورد و تازەکردنەوەی کولتووری کوردی.

ئەم دوورەوڵاتییە خواستمەندانەیەی (گەنجە کوردەکان) بەتایبەتی لە ئەستەمبۆڵدا بە یەکەمین هەنگاو لە قەڵەم دەدرێت لە مێژووی دوورەوڵاتیی کورددا، کە وەک دەستاوەردێک بەشێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراو بەکاری

بهێن بۆ دروستکردنی دیالۆگێکی شارستانیانه لەگەڵ کولتووری ڕۆژئاوادا: لەپێناو تازە کردنەوەی ڕووناکبیری و بوژاندنەوەی ژیانی کولتوری و سیاسیی کورد.

بەشێوەیەکی گشتی: لەسەر دەستی ئەو نووسەرە گەنج و قوتابییە کوردانەدا بوو کە بیر و نووسین، بیری نەتەوایەتی و ڕوژنامەنووسی، بیری یاخیگەری و ئەدەب،، تێکەڵ بە یەکتر بوون؛ چەمکی تازە لەبارەی سیاسەت و ژیان و ژن و کولتوور و شارستانیەت هاتنە ئاراوە و کۆمەڵێک تێگەیشتنی هاوچەرخ و بیروڕای تازە سەریان هەڵدا. بۆ نموونە گرووپی نووسەرانی گۆڤاری ژین ( ١٩١٨ ـ ١٩١٩ ) ، کە کۆمەڵێک قوتابی و گەنجی کورد بوون و لە ئەستەمبوڵ دەژیان، پشتیان بەستبوو بە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیەتێکی هاوچارخ و سیستەمێکی تازەی بیرکردنەوە و نووسین. دروشمیان لەم دێڕەدا وەدیار دەکەوێ کە لە وتاری " بیر حەسبحال " بە زمانی تورکی لە ژمارە (١)دا لە ٧ /١١ ١٩١٨ دا نووسیویانە : " ئایدیۆلۆژیەتە کۆمەڵایەتی و سیاسیە کۆنەکان، ئەمڕۆ، ڕوو لە هەرەسن. ئێمە ئەمڕۆ بەشداری لە سازکردنی چەند ڕچە و پرینسیپێکی تازە دەکەین".

یان ئەو قوتابی و گەنجانەی کە لە ١٩١٢ یەکەمین ڕێکخراوی خوێندکاران لە مێژووی کورددا دادەمەزرێنن بە ناوی (هیوی- جەماعەتی تەلەبەی کوردان) لە ئەستەمبوڵ، پاشان گۆڤارێکیش بۆ بڵاوکردنەوەی فەلسەفەی ڕێکخراوە خوێندکاریەکەیان دادەمەزرێنن بە ناوی (ڕۆژی کورد) کە نەجدەت دیاربەکری و عبدالکریم سلێمانی و د. عبدالله جەودەت و ساڵح بەدرخان چەندین وتاری ئازادیخوازانەی تێدا لەبارەی یاخیبوون و ڕاپەڕینی گەنجانە تێدا دەنووسن. (هینکەری زمانی کوردی) ناونیشانی نامیلکەیەکی ٦٥ لاپەڕەییە بۆ فێرکردنی زمانی کوردی، بە زمانی تورکی و بە هەر دوو دیالیکتی ژوور و و خواروو، لە ساڵی ١٩٢١ لە ئەستەمبوڵ لە چاپخانەی (نجم استقبال) دا چاپ کراوە. ژمارەی یەکەمی زنجیرەی بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی قوتابیانی کورد (هیڤی) بووە لە ئەستەمبوڵ.

جگە لەمەش هەر لە ئەستەمبۆڵدایە کە لە مانگی گوڵانی ١٩١٩دا بۆ یەکەم جار (کۆمەڵەی پێشکەوتنی ژنانی کورد/ کورد قادینلار تعالی جمعیەتی) دادەمەزرێت لە پێناو گرێدانەوەی خەباتی ئافرەتانی کورد بە خەباتی نەتەوەییەوە. بەم شێوەیە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کوردستاندا ئافرەت دەست پێ دەکات هێزی یاخیگەرانە - شانبەشانی پیاو - پتەوتر بکات و ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتیانە و فەلسەفییانە ببەخشێتە خودی.

بەم شێوەیە، (گەنجە کوردەکان) یەکەمین نەوەی ڕووناکبیرانی کوردن کە دوورەوڵاتییان، بۆ یەکەمین جار، وەک «پرۆژەیەکی مەعریفی» بەکارهێنابێت. یەکەمین هەنگاوی ستراتیژییان بڵاوکردنەوەی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بوو لە ساڵی ١٨٩٨دا لە شاری قاهیرە و ژنێف؛ پاشانیش- لە ماوەی ساڵانی ١٩٠٠-١٩٢٣دا لە ئەستەمبۆڵ، دامەزراندنی یەکەمین چاپخانە و قوتابخانە کوردییەکان و چەندین ڕێکخراوی پیشەیی و سیاسیی گرنگی وەک ڕێکخراوی (جەمعیەتی تەعالی و تەرەقیی کورد) لە ١٩١٨.

لە ١٩٠٨ یەکێک لە یەکەمین قوتابخانە کوردییەکان لە ئەستەمبۆڵ لە گەڕەکی دیوانلی لەلایەن عبدالرحمن بەدرخانەوە دامەزرا، پاشان لە ١٩٠٩ قوتابخانەیەکی دیکە بە زمانی کوردی لەناو بینایەی ڕێکخراوی "کورد نەشری مەعاریف جەمعیەتی" هەر لە ئەستەمبۆڵ کرایەوە کە خەلیل خەیالی و ئەحمەد کوردیزادە دایانمەزراندبوو. هەر لەو ساڵانەدا ١٨٩٨- ١٩٢٠ چەندین ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی لە ئەستەمبۆڵ بڵاوکرانەوە: کورد، کوردستان، ڕۆژی کورد، هەتاوی کورد، ژین.. هتد، هەروەها چەندین ڕێکخراوی پیشەیی و خوێندکاری و گەنجانە و سەنتەری ڕووناکبیرانە لەوێ دامەزران؛ جگە لە چەندین قوتابخانەی مۆدێرن بە زمانی کوردی.

لەڕێگەی ئەم گۆڤار و ڕۆژنامە و سەنتەر و قوتابخانە و کۆمەڵە ڕۆشنبیرییانەی ئەستەمبۆڵەوە بوو کە بۆ یەکەمین جار نووسەر و قوتابی و ڕووناکبیرانی گەنج و نوێخواز دەردەکەون و باوەڕ بە هێزی نوێخوازانەی خۆیان پەیدا دەکەن و دەتوانن ببن بە هێزێک و مەترسییەک بۆ سەر دەوڵەت.

دیسان هەر لە ئەستەمبۆڵدایە کە شاعیری نەوجەوان، زێوەر ١٨٧٥ ـ ١٩٤٨ یەکەم شیعری خۆی لە ١٩١٣ لە گۆڤاری ڕۆژی کورد بڵاوکردۆتەوە. بە هەمان شێوە پیرەمێرد بۆ یەکەمین جار یەکەمین شیعری خۆی لە ئەستەمبۆڵ بڵاوکردۆتەوە، ئەمەش لەسەر لاپەڕەی گۆڤاری کورد لە ١٩٠٨. جگە لە دەیان شاعیری تازە دەرکەوتووی دیکە کە هەموویان لە ئەستەمبۆڵەوە سەردەردەکەن و شۆرەت پەیدا دەکەن:: عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، کامەران بەدرخان، محمد میهری، سیاپۆش، ئەمین عالی بەدرخان ، نەجدەت کەرکووکلی، داوەر ئەردەڵانی، مستەفا شەوقی.

دیسان لە ئەستەمبۆڵەوە: لە ١٩١٣ لە گۆڤاری ڕۆژی کورد لە ژمارە (٢)دا لە لاپەڕە ٨٢، ئەم شیعرەی حاجی قادری کۆیی بڵاوکراوەتەوە کە نووسەران هاندەدات تەرجەمە بکەن:

بێگانە بە تەرجومەی زوبانی
ئەسراری کتێبی خەڵقی زانی

بەم شێوەیە، وەرگێڕانیش، دیسان، لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی ئەستەمبۆڵەوە دەست پێ دەکات بەتایبەتیش لەسەر لاپەڕەی گۆڤارەکانی (ڕۆژی کورد) و (کوردستان) و (ژین) لە ١٩١٨ بەملاوە.

پیرەمێردی شاعیر بۆ خۆی لە ماوەی خوێندکاری و گەنجێتیی خۆیدا لە ئەستەمبۆڵ (١٨٩٧-١٩٢٣)، لەناو ئەم جموجۆڵەدا ژیاوە و دیپلۆمی حقووقی لە زانکۆی ئەستەمبۆڵ وەرگرتوە و ئەندامی پەرلەمان ( مەجلیسی عالی) بووە لە دەوڵەتی عوسمانیدا، شایەدیمان بۆ دەدات:

«ئێواران، کە لە ئەستەمبۆڵەوە بە واپۆڕ ئەگەڕامەوە بۆ لانەی سەعادەتی خۆم، کە ئوطظە بوو، وە کە سەروەتی فنوونم لە گۆگرتەی ئەو واپۆڕی سەر دەریای مەڕمەڕەیەدا ئەخوێندەوە؛ تەئسیری ئەو شیعر و ئەدەبیاتە لە سندبادی بەحری زیاتر ئەیخستمە سەر دەریای خولیاوە».

بەم شێوەیە، دەبینین گەنج و قوتابیانی کورد لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە، بەتایبەتی لە ئەستەمبۆڵ و پاشانیش لە شارەکانی قاهیرە و

ژنێڤ و پاریس، لەڕێگەی دامەزرانی قوتابخانە و ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕێکخراوی خوێندکارانە و ڕووناکبیرانەوە، دەبنە دامەزرێنی مۆدێرنیزمی کوردی و بناغەی ڕاپەڕینێکی کولتووریی ئەوتۆ کە هەرگیز هاوتای لە مێژووی کوردستاندا نەبووە.

کەواتە، ئەمەتا، مەلا و شێخ و ئوستاد و میرەکان نەبوون ئەم ڕاپەڕینە کولتوورییەی سەرەتای سەدەی بیستەمیان دروستکرد: نەسلێکی نوێی قوتابی و گەنج بوون، کە توانییان بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردستاندا دەرگا و سنوورەکانی شارۆچکەکانی خۆیان بشکێنن و خۆیان بگەیەننە ئەستەمبوڵ و ژنێف و قاهیرە و پاریس، لەوێوە بتوانن هەندێکیان بخوێنن و ئەوانی دیکەش هیچ نەبێ زمانە ئەوروپییەکان فێر ببن بۆئەوەی بتوانن ئەو ڕێنسانسە لە کوردستاندا بەرپا بکەن.

ئەو قوتابی و نووسەرە گەنجە ئاوارانەی ئەستەمبوڵ، لە ١٩٢٣ بەملاوە، کاتێ خوێندنی خۆیان تەواو دەکەن، یان یەکسەر لەدووای قەدەغەکردنی زمان و کولتووری کوردی لەلایەن ڕژێمی فاشیستی تورکیاوە، پەیتا پەیتا، گەڕانەوە بۆ کوردستان:ماڵێکی کولتووریی هێندە ڕەسەن و بەبرشتیان دروستکرد کە تا ئەمڕۆش، ئێمە، لە سای بەرهەم و سێبەری ئەواندا دەژین..

کەواتە، لە ئەستەمبوڵ و قاهیرە و ژنێف و پاریسەوە، بەرەو سنە و هەولێر و مهاباد و سلێمانی و دیاربەکر و کەرکووک و قامشلوو..

# ئانارشیزم

ئەمری سوڵتانان هەموو تەکلیف و قەید و زەحمەتە
طورەی ئازادی و خطووطی شادییە فەرمانی دڵ

حەمدی

تاکو ئەمڕۆش هەر -وەک سەدەکانی ڕابردوو- گەنج و قوتابیانی کورد پێیان ئەسفە لە دژی «حکوومەتێکی کوردیی خۆیان» یاخی بن و ڕاپەڕن، یان بێن ئاژاوەیەک بنێنەوە و دڵی دوژمنی خۆیانی پێ خۆش بکەن و زبان بگەیەنن بەم حکوومەتە ساوا «نەتەوەییە». بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستییە ئەوەیە کە لەم دوو - سێ ساڵەی ڕابردوودا گەنج و خوێندکاران، بەتایبەتیش، ئەوانی زانکۆکانی هەولێر و سلێمانی، چەندین خۆپیشاندانی گەورە و گورچووبڕی ئەوتۆیان سازکردووە کە ئەگەر خۆیان بە ویست و بڕیاری خۆیان ڕایان نەگرتایە بازنەیەکی گەورەتری پەیدا دەکرد، فراوانتر و بەزەبرتر دەبوو!

لێرەوە دەکرێ بوێرین بیر لەوە بکەینەوە «کە لەناو خۆماندا» بە چرپە بە یەکتر بڵێین: مەسەلەی «ئەمنی قەومیی کورد» سەرسەختترین دوژمنی گەنج و قوتابیانی کوردە، هۆیەکی سەخیفە لە بەردەم ئەو گۆڕانسازییانەی پێویستە وەدی بهێندرێن.

کەواتە، ئایا ڕاپەڕینی گەنج و خوێندکارانەی گۆڕانساز سەرهەڵنادات تا ئەوکاتەی کورد لە مەترسیی دوژمنەکانی خۆی ڕزگاری دەبێت؟ بە بۆچوونی من: هەموو چارەنووسی نەسلی نوێ لەنێو ئەم پرسیارەی سەرەوەدا کۆدەبێتەوە؛ کە دوڕیانێکە و چارەنووسی نەسلی نوێمانی پێوە بەندە: ئایا هیچ نەکەین، یاخی نەبین، ڕانەپەڕین، هیچ نەگۆڕین نەوەک «حکوومەتە ساواکەمان» لێ تێک بچێت؟!

ئەمە هەمان ئەو پرسیارە بوو جاران مەلا ڕۆشنبیرە گەنجەکان و فەقێکان و موستەعیدەکان و هەندێک لە شاعیرانی منەووەریش لە خۆیانیان

کردووه. ئەوان بێدەنگییان هەڵبژارد و کەوتنە سەنگەری بەرگریکردن لە میر و میرنشینەکانمان. جارێ هێشتا کەس نازانێ ئاخۆ نەسلی نوێی ئەمڕۆش چی بڕیار دەدات لە داهاتوودا: ئایا وەک نەسلی کۆن و منەوەرەکانی جاران هەر لە سەنگەری پاراستنی «کورد» دەمێنێتەوە یان بەڕاستی دەکەوێتە سەر پراتیک کردنی جەوهەری یاخیگەرانەی خودی خۆی؟!

لێرەدا، بە حەیفێکەوە حەزدەکەم دان بەوەدا بنێم و بڵێم: بەڵێ، ڕاستە، سەبارەت بە لێکچوونی دۆخی جاران و ئەمڕۆ، ئێستاش هەر - سەبارەت بە ڕۆڵ بینینی نێگەتیفانەی مەسەلە نەتەوەییەکە - ئەم ستەم و کۆیلەکردنەی خوێندکار و گەنج، تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە. بەڵێ، وابزانم هەمووومان دەوێرین دانی پێدا بنێین: ئەمنی قەومیی کورد بەربەستێکی گەورەیە لەبەردەم پێشکەوتنی قوتابی و گەنجانی ئەمڕۆی کوردستان.. ئەمنی قەومیی کورد لەمپەرێکی دوژمن ئاسای ڕەزاقورسە و ناهێڵێت توێژی تووڕەی خوێندکار و گەنجی ئەمڕۆ ڕێگە بە خۆیان بدەن هێزی میللەت دابڕێژنە سەر شەقامەکان. وابزانم هەر بۆیەش بوو لە خۆهەڵبژاردنەکانی ئەم دواییەی پەرلەمانی کوردستاندا، زۆربەی هەرە زۆری گەنج و تەڵەبەی کورد، سەرەڕای ئەوەی دەیانزانی کاندیدەکانی «لیستی هاوبەش» بۆ پەرلەمان زۆربەیان کۆنەبەعسی و سەرۆک جاش و سەرۆک عەشیرەت و خەڵکی پیر بوون، بەڵام پێیان بە جەرگی خۆیانەوە نا و ناچار ناچار دەنگیان دایەوە بە «لیستی هاوبەشی حزبە کوردستانییەکان». ئەمە بۆ ئەوە بوو کە «حکوومەتە فیدڕاڵییە کوردییەکەمان» بە هەرچی چۆنێک بێت سەربگرێت و کورد بتوانێ ببێتە ئەو هێزەی لە عیراقی داهاتوودا سەنگی خۆی هەبێت.

ئەمەتا، ئەمە مانای وایە تاکو ئەمڕۆ بیری «کوردایەتی» و ناسیوونالیزمە ڕێبەرایەتیی گەنج و تەڵەبەی کوردستان دەکا؛ لەمەش خراپتر بیری ململانێی حیزبایەتییە بزاڤی لاوان و خوێندکاران لە وڵاتی ئێمەدا ڕێبەری دەکات. هەر ئەمەیشە ئەو جیاوازییەی لەنێوان بزاڤی خوێندکارانەی

ئەورووپا و کوردستاندا هەیە.

بزاڤی قوتابیانە و گەنجانەی ئەورووپا بیری ئازادیخوازی و تاکگەرایی Individualisme و مارکسیزمی نوێ و تا ڕادەیەکیش ئاژاوەخوازی بەڕێوەی دەبرد و دەبات، بەڵام ئەوەی کوردستان بیری ناسیوونالیزم (کە ئەویش دابەشکراوەتە سەر دوو حزبی پاوانکار) سەرکردایەتیی دەکات. هەر ئەمەیشە هۆی ئەوەی بزاڤە خوێندکاری و گەنجانەکان لە وڵاتانی ئەورووپادا هەمیشە بەر و بەرهەم و ئاکامی بەسوود و گەشاوەیان لێ دەڕوێت و ئەوانەی لای ئێمە هەمیشە، کۆستکەوتوو، لەڕ و لاواز، ڕێگەی سەعاتەڕێیەک بە سێ ساڵ دەبڕن، لە سنوورێکی زەرد یان سەوز یان سپی زیاتر هیچی دیکە نابینن!

تووانەوە دەنێو حیزبدا!
تووانەوەی نیو ملیۆنێک قوتابی و گەنج دەنێو یەکیەتیی نیشتیمانیی کوردستاندا، تووانەوەی نیو ملیۆنێکی دیکەی خوێندکار و لاو دەنێو پارتی دیموکراتی کوردستاندا، تووانەوەی چارەگە ملیۆنێکیش دەنێو حیزبە ئیسلامیەکاندا، تووانەوەی چارەگە ملیۆنێکی دیکەش دەنێو حزبی شووعی و زەحمەتکێشان و ئەوانی دیکەدا.

تووانەوە دەنێو حیزبدا! ئەمەیە ئەو ماددە بێهۆشکەرەی ڕاپەڕینی خوێندکار و یاخیبوونی گەنجانەی نەسلی نوێی ئێمەی دوواخستووە.

ئەمە لەکاتێکدا گەنج و قوتابیانی فەرەنسا لە ڕاپەڕینەکەی خۆیاندا لە مایسی ١٩٦٨ دژی بێکاری و فەساد و ستەم و ڕۆتین و عەقڵە پیرەکەی فەرمانڕەوایان، گوێیان نەدایە هیچ ئیعتبارێکی نەتەوەیی و حیزبی و دینی و «ئەمنی قەومیی وڵاتی خۆیان»، بۆیە ڕاپەڕینەکەیان سەرکەوت و بووە هۆی ریفۆرم و گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە ژیانی مۆدێرنی فەرەنسا و تەنانەت لە هەموو ئەورووپاش.. کە لەکۆتاییدا ئەمنی قەومیی فەرەنسای

بەهێزتر و پتەوتریش کرد. (چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا سەرۆک حیزب و مەکتەبی سیاسیی حیزبەکان لەترسی ڕای جەماوەر و بزاڤی گەنجانە و خوێندکارانە ناچار دەبن چاو لە هەندێ بەرژەوەندییەکانی خۆیان بپۆشن و ڕێگای ڕاست بگرنە بەر!).

ئەم ڕاپەڕینە خوێندکاری و لاوانەیەی فەرەنسای ١٩٦٨، بێ ئەوەی هیچ پێوەندانگێکی نەتەوەیی و عەشایەری و حیزبی و دینی و ئەمنی قەومی بە لایەوە گرنگ بێت، بێباک بەرامبەر حیزب و کەنیسە و خێزان و دەسەڵاتی نەتەوەیی، بوێرانە، ئەم دروشمە ئانارشیستە جوانانەیان بەرز کردبۆوە:

با (قەدەغەکردن) قەدەغە بکرێت!
دەرگای پەناگەکان بکەنەوە، دەرگای زیندان و قوتابخانەکانی دیکەش!
با واقیعی بین: هەرچی شتێک نامومکینە، داوای بکەین!
چیتر خۆتان نارەحەت مەکەن: خەڵک نارەحەت بکەن!
گوو لە کۆمەڵگە دەکەم .. ئنجا دڵم خۆش دەبێ.
«پیرۆز» دوژمنی ئێمەیە.
مێشکتان وەک زنجیری پانتۆڵەکانتان.. بکەنەوە!
دڵی خۆت خۆش بکە: بێ ئەوەی گوێ بدەیتە بەربەستەکان!
بژی: بێ ئەوەی گوێ بدەیتە وەختە مردووەکان !

بەم شێوەیە، لە کاتی تووڕەبوون و یاخیبووندا، واتە لە کاتی ڕاپەڕیندا هیچ خوێندکارێک پێویستی بەوە نامێنێ بزانێ ئاخۆ باو و باپیرەکانی کێ بوونە؟ یان سەر بە کام عەشیرەت و حیزبە!

لە کاتی دارژانە ناو جادە و ڕاپەڕیندا، هیچ گەنجێک پێویستی بەوە نامێنێ بپرسێ ئاخۆ حکوومەت و زانکۆ و دەزگاکانی دیکە بەو ڕاپەڕینەی ئەو دڵخۆش یان سەغڵەت دەبن؟! هیچ گەنجێک بیر لەوە نەکاتەوە «ئەمنی قەومی» چیە یان ئاخۆ «عیراقی ئازیز» پارچە پارچە دەبێ یان نا؟!

ئەمڕۆش، ئەوەتا:

گەنج و تەڵەبەی ئەمڕۆ - سەرەڕای ئینتیمای حزبیشیان - لە خۆیان دەپرسن: ئایا ئەم حزبە کوردستانیانە هەمان ئەو عەشیرەت و میرنشین و سەرۆک هۆزانەی جاران نین لەشێوەیەکی هاوچەرخدا؟ هەمان ئەو دەسەڵاتە نین کە لەبەر خاتری ئەوان بوو هەموو ژیانی گەنج و تەڵەبەی ئەو پازدە ساڵەی ڕابردوو لەنێو ستەم و تاریکی و جەهالەتدا بەهەدەر چوو؟

گەنج و تەڵەبەی ئەمڕۆ - سەرەڕای ئینتیمای حزبیشیان - لە خۆیان دەپرسن: ئایا ئەم حزبە کوردستانیانە، بۆچی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی خۆیان و وەزیرەکانیان، دەسەڵاتدارەکانی دیکەیان و پەرلەمانتارەکانی سەر بە ئەوان، مەنسوولەکانی دیکەیان و دەستندەخۆرەکانیشیان، هەروەها سەرتاپای ماڵ و منداڵ و خزم و کەسوکارەکانیشیان، بۆیان هەیە لەوپەڕی ئاسوودەییدا بژین؛ بەڵام گەنج و تەڵەبە، فەرامۆشکراو، لەناو ڕەزالەت و نالەباری و بێبەری بووندا، لەناو تاریکی و بێکاری و بێ کارەباییدا، لەناو ستەم و نەداریدا، نەیانتوانیبێ تەنانەت لە شارەکەی خۆیان زیاتر هیچ شوێنێکی دیکەی دنیا ببینن!؟

گەنج و تەڵەبەی ئەمڕۆ - سەرەڕای ئینتیمای حزبیشیان - لە خۆیان دەپرسن: ئایا ئەم حزبە کوردستانیانە، لە جەوهەر و ناوەڕۆکدا، بەڕاستی، بریتی نین لە (دەسەڵات)، تەنانەت دەسەڵاتێکی «پیرۆز» و «تەوتەم» و چەوسێنەریش؟

گەنج و تەڵەبەی ئەمڕۆ - سەرەڕای ئەم ئینتیما حزبییەشیان - لە خۆیان دەپرسن: ئایا ئەم حزبە کوردستانیانە، لە جەوهەر و ناوەڕۆکدا، بەڕاستی، لەڕێگەی ئەو هەموو دامودەزگا سەرکوتکەرە جۆراوجۆرانەی هەیانە، بەرپرسی یەکەم نین لەو ڕەزالەت و برسێتی و تاریکی و بێکاری و دواکەوتنەی کۆمەڵگەی کورد بەدەستییەوە دەتلێتەوە؟! ئایا خودی «ئەم دەسەڵاتە کوردییە» بەرپرسی یەکەم نیە؟

حاجی قادری کۆیی، گەنجێکی یاخیگەر و ڕاپەڕیوی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمی کوردستان، لە دێڕە شیعرێکیدا دەڵێ:

«چوونەژێر باری ڕیاسەت کەری و ئەحمەقییە».

ئەم دێڕە شیعرەی حاجی، دەقاودەق ناوەڕۆکێکی ئانارشیستانەی (ئاژاوەخوازی) هەیە؛ پێمان دەڵێ: مافەکان و ئازادییەکان تەنیا لەڕێگەی ڕەفزکردنەوەی دەسەڵات و بەگژداچوونی ئەو دەسەڵاتەوە وەدەست دەهێندرێن!

ئانارشیستەکان، واتە ئاژاوەخواز و ئاژاوەگێڕەکان یەکێک لە دروشمەکانیان بریتی بوو لە ڕەفزکردنەوەی هەرچی دەسەڵاتێک کە هەیە، دەیانگوت (**نە خوا، نە فەرمانڕەوا** Sans Dieu Ni Maitre ). ئەم فەلسەفە تازەپشکووتووەی حاجی، لەو زەمانەوە، خۆئامادەکردنێکی سەرەتاییە - بە بۆچوونی من - بۆ هەنگاونان لەپێناو وەدەستهێنانی ئازادی و مافەکانی گەنج و تەڵەبەی ئەمڕۆ.

# سالانی ١٩٦٠

ئایا لەدووای «گەنجە کوردەکانەوە» تا ئەمڕۆ، بزاڤی خوێندکار و لاوانی کورد، چۆن هەڵبسەنگێنین؟

تاکو ئەمڕۆی دووای ڕاپەڕین، بزاڤێکی ئەوتۆی سەربەخۆ کە دەربڕی خودی جەوهەری گەنجانە و خوێندکارانە بێت، لە مێژووی کوردستاندا ڕووی نەداوە.

بزاڤەکە لە هەر قۆناغێکدا بەشێوەیەک بووە، بەرزی و نزمییەک هەبووە، بەڵام نەگەیشتۆتە ئاستی ئەوەی جەوهەرێکی یاخیبوونی گەنجانە و خوێندکارانە سنگی خۆی بێنێتە پێشەوە و ئەکشنێکی مەزنی هەبێت.

بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٣٥دا لە بەغدا دەستەیەکی لاوانی کورد پەیدا دەبن (دیاریی لاوان یادگاری لاوان ) بلاودەکەنەوە لەگەڵ بلاوکردنەوەی زنجیرە کتێبێک و چەند چالاکییەکی ڕۆشنبیریی دیکە، بەڵام لەلایەکەوە سنووری چالاکییەکانیان تەنێ بلاوکردنەوەی ئەدەبیات بوو، لەلایەکی دیکەشەوە ناوەڕۆکێکی نیشتیمانپەروییانە (کوردایەتییانەیان) هەبوو: نەگەیشتبووە ئاستی یاخیبوونی گەنجانە و خوێندکارانە واتە جەوهەری بیری خوێندکاری و گەنجانەیان تێدا نەبوو. جگە لەمەش لەباری جوگرافییەوە تەنێ لە بەغدا گیرسابوونەوە و سەنگێکی ئەوتۆیان لە کوردستاندا نەبوو.

نموونەیەکی دیکەی ئەو بزاڤە خوێندکارییە، بریتییە لە دامەزراندنی یەکیەتیی خوێندکارانی کورد و یەکیەتیی قوتابیانی کورد لە سالانی چلەکان و پەنجاکاندا واتە ئەو یەکیەتییە خوێندکاری و قوتابیانەیەی کە دروستکراوی پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبەکانی دیکە بوون. ئەوانیش بە هەمان شێوە گرێدراوی حیزب و پارتەکانی کوردستان بوون، وەک ئەوە وابوون کە لقی حیزب و نوێنەری حیزب بن لە بارەگا و شوێنێکی دیکەدا. ئەگەر ئەو قسە بەرز و جوانەی مەلا مستەفای بارزانی، سەرۆکی بزاڤی نەتەوەیی کورد بە نموونە بهێنینەوە بۆ قەناعەت پێ گۆڕینی خۆمان

که دەڵێ (قوتابیانی سەری ڕمن لە هەموو شۆڕشێکدا)؛ ئەوا لە نرخی ئەم ڕایەمان کەم ناکاتەوە کە توێژی گەنجان و قوتابیان هەر دیسان نەیانتوانیوە - بە قەد ئەمڕۆی دووای ڕاپەڕین - تەعبیر لە جەوهەری یاخیبوونی گەنجانە و قوتابیانەی خۆیان بکەن.

لە لایەکی دیکەشەوە نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە لە بەستێنە جۆراوجۆرەکانی ئەدەبدا گەنج ڕۆڵی خۆی باش نوواندووە. ئەمەش هەر لەگەڵ هەنگاوی گەنجە لاوەکانەوە، کاتێ شێخ نووری شێخ ساڵح، خاکەڕایانە، باوەڕدار بە هێزی گەنج، لەژێر کاریگەرێتیی بیری گەنجە تورکەکاندا مژدە دەبەخشێتە گەنجانی کورد و دەڵێ:

صبحەینێ ئەم تەجەدودە بۆ تۆیە ئەی شەباب
بۆ تۆیە ئەی ئومێدی وەتەن، خادیمی حەیات
ئەی ئافتابی فەجری تەمەن، مایەی نەجات!
ئەی فەجری بێ غوبار و کەدەر؛ عالەمی ئەمەل
چاوی لە تۆیە، تۆ کە ئومێدی هەموو کەسی !
ئەلحەق عیلاجی دەردی، دەوایەکی نەورەسی!

تا دەگاتە نووری وەشتی و بزاڤی شاعیرانی کفری و ڕووانگە لە کۆتایی ساڵانی شەست و ١٩٧٠دا.

به شێوەیەکی گشتی، ئەمڕۆ، سەبارەت بەو هەلومەرجە تازەیەی لەدووای ڕاپەڕین و ئازادبوونی کوردستان هاتۆتە پێشەوە، قۆناغێکی بوێر و بێ وێنە لە هوشیاریی گەنج و قوتابیاندا سەری هەڵداوە، کە بێ هاوتایە و دەکرێ ببێتە هەوێنی «شۆڕشێکی خوێندکارانە و گەنجانە» لە کوردستاندا..

# بزاڤی خوێندکاران دیاردەیەکی جیهانییە

هاننا ئارنێت

لینین و پاشان مەلا مستەفای بارزانیش جەختی لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە خوێندکاران هەمیشە سەری ڕمن لە هەموو شۆڕشێکدا. باشە، ئەدی بۆچی ڕۆشنبیران و مامۆستایان، مامۆستایانی زانکۆ، کرێکاران یان جوتیاران ئەم ڕۆڵە شۆڕشگێڕییە ناتوانن ببینن؟ بۆچی ئومێد و باوەڕمان هێندە بە گەنج و قوتابی هەبێت لەجیاتی هەموو توێژەکانی دیکە؟!



من نالێم ڕۆشنبیر و کرێکار و مامۆستای زانکۆ و جوتیاران و خەڵکی دیکە ناتوانن بەشداری لە پرۆسەی گۆڕین و لە هەڵگیرساندنی ڕاپەڕینەکان بکەن، خۆیشم وەکو تووتی لێ ناکەم بێم هەمان ئەو بیردۆزەی هێربەرت مارکۆز بجوومەوە لەبارەی کۆمەڵگەی ئامریکایی و ئەورووپییەوە و بڵێم:

«چونکە کرێکار و جوتیار هوشیاریی چینایەتییان نەماوە و داخزاون، ئیتر بۆیە ناتوانن خۆیان ڕێک بخەن و نایانەوێ شۆڕش بکەن».

بە هەمان شێوە ئەو ڕاستییە دروست و واقیعییانەش هەر ناجوومەوە کە فەیلەسووفێکی یاخیگەری وەک مەسعوود محەممەد لە (مرۆڤ و دەوروبەر)دا پێی گەیشتووە کە دەڵێ:

مێژوو بە وەرزێری نەخوێندووی جندووکەپەرست بەرەوپێش ناڕوات.. چونکە وەرزێر و کرێکار و هەژاری عادەتی، لە خەون و خەیاڵیشدا نابن بە حکوومەت: هەر نەبێ لەبەر بێ سەوادی کە ناتوانن ناوی خۆیان بنووسن چ جایی ئەوەی ببنە وەزیر و سەرۆک سپا و زانای زەڕڕە و پزیشکی شێرپەنجە و چوونە ئاسمان.. ئەمانە هەرگیز و هەرگیز نابن بە حکوومەت مەگەر دەرچن لەو قەپێلکە و ببن بە بۆرجوازی..

هەروەها (هاننا ئارنێت) خاوەن کتێبی ناوداری (تۆتالیتاریزم) دەڵی کە «بزووتنەوەی گەنج و خوێندکاران بزووتنەوەیەکی جیهانییە و لە هەموو وڵاتێکدا بەرپا بووە».

من ئەگەر کارم بە هیچ یەکێک لەو فەیلەسووفانەشەوە نەبێ، خۆ ئاشکرایە و زۆر بە سادەیی دەتوانم بۆ خۆیشم تەماشای دەوروبەری خۆم بکەم و بیربکەمەوە و لەئەنجامدا بڵێم: گەنج و قوتابیانی کوردستانی ئەمڕۆ لە هەموو چین و توێژە ناوبراوەکانی دیکە هوشیارتر، چالاکتر، شایستەتر و ئامادەترن بۆ ئەو ڕاپەڕینە پێویستەی بەرەو ریفۆرم و گۆڕانکارییەکان دەڕوا.

– بۆچی؟

– دوور لە هەموو تیۆر و قسەیەکی نێو کتێبان: جارێ جوتیاری بەستەزمان ژمارەیەکی ئەوتۆیان -لەبەر تەڕحیل و تەعریب و ئەنفال – لە

گوندان نەماون کە بتوانن تەنانەت ڕۆژێ دوو قسانیش لەگەڵ یەکتر بکەن، چ جای خۆڕێکخستن و لەیەکترکۆبوونەوە و خۆپیشاندان! ئەگەر بشیانەوێ بێنە ناو شار خۆپیشاندانێک ساز بکەن بۆئەوەی حکوومەت ناچار بکەن گوێیان لێ ڕابگرێ: ئەوا دەبێ هەر یەکێکیان دوو سێ مۆبایل و سیمکارتی جۆراوجۆریان لەوانەی (ئاسیا سێل) و (کۆرەک تێلێکۆم) و (سانا تێل) لە باخەڵدا هەبێت بۆئەوەی بتوانن کۆبوونەوەکانی خۆیان لەناو شاردا بۆ سەعاتی سفر لەگەڵ یەکتر ڕێک بخەن؛ ئنجاش پێویستە «حیزبێک» هەبێت هوتێل و حەوانە و خواردن و خواردنەوەیان بۆ دابین بکات لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژانەی مان دەگرن یان خۆپیشاندان سازدەکەن!

دوور لە هەموو تیۆر و قسەیەکی نێو کتێبان: کرێکارانیش بە هەمان شێوە. بەڵام لەبەرئەوەی ئەمان زۆرتریان لەناو شاردا دەژین و تا ڕادەیەکیش لەنێو سەندیکا و ڕێکخراوەکاندا خۆیان ڕێکخستووە، ئومێدێکی هەندێک زیاتریان لێدەکرێت -لەچاو جوتیاران و ڕۆشنبیران و مامۆستایان- کە بتوانن لە داهاتوودا جووڵەیەک بکەن! بەڵام ئەمانیش هەر پێویستییان بە هێزێکی لەخۆیان هوشیارتر و مەزنتر هەیە: چونکە دەرکەوتووە و ئاشکرایشە ستالینیزم و حیزبە کۆمۆنیستەکان نەیانتوانیوە ئاراستەیان بکەن بەرەو هیچ بزاڤ و شۆڕشێک.. تەنانەت لە ساڵی ١٩٦٨یشدا لە فەرەنسا گەنج و خوێندکاران بوون پێشڕەوایەتیی کرێکارانیان کرد و ئاڵای سووری ئەوانیشیان لەپاڵ ئاڵای ڕەشی خۆیاندا بەرزکردبۆوە و هاواریان دەکرد: «ئەی ستالینییەکان، ئەوەتا ڕۆڵەکانتان لەگەڵ ئێمەن» یان دەیانگوت «مرۆڤایەتی ئاسوودە نابێت تا ئەوکاتەی دوایین سەرمایەدار لەسێدارە دەدرێت!».

حزبە چەپەکان (کوردستانییەکان) بە حیزبی شووعی و کۆمۆنیستیشەوە، زۆر بەهێزترن لە سەندیکاکانی کرێکاران. هەر ئەمەیشە هۆی نوستنی کرێکاران (یان نوستاندنی کرێکاران) و سەرهەڵنەدانی یاخیبوون لە وڵاتی ئێمەدا.

جگە لەمەش کۆمەڵێک تەکنۆقرات و کادر و مودیر هەن کە حیزب داینـاون و دەستڕۆن؛ ئەوان هێزن و «دەور دەبینن»: نەک کرێکاران. بەم

حاڵەش کرێکاران لە خوارەوەی خوارەوەدا دەمێننەوە، هەرگیز نابنە خاوەن کولتوورێک کە ئەکشن و چالاکی و یاخیبوون بەرهەم بهێنێ؛ بەردەوام «کولتووری بەرێوەچوون» بەرێوەیان دەبات.

دیسانەوە دوور لە هەموو تیۆر و قسەیەکی نێو کتێبان: ڕۆشنبیرانیش بە هەمان شێوە، دابەشکراونەتە سەر دوو حیزبە سەرەکییەکەی کوردستان (تەنانەت ئەوانەی ئەکتیڤن هەر لەناو دەسەڵاتدان!)؛ ئەوانەی بە خۆشیان دەڵێن «ئۆپۆزیسیۆن» لە سێبەری حیزبە ئیسلامی و شووعی و بەناو چەپەکانی دیکەدا دەورێکی ئەوتۆیان نیە. ئەوەی دەشمێنێتەوە، ژمارەیان ناگاتە ژمارەی پەنجەکانی دەست.

لە ساتە خەتەرناکەکاندا زۆربەی نووسەر و ڕۆشنبیران لایەنگیریی هەڵەی حیزبە فەرمانڕەواکانیان کردووە. تەنانەت زۆربەیان - بە هەندێ لە شاعیرە گەورەکانیشەوە - بۆ نموونە لە کاتی شەڕی براکوژیدا فتیلی ئاگری جەنگەکەیان گەرمتر دەکرد. لەکاتی ئاشتبوونەوەی مەکتەبیی سیاسیی دوو حیزبەکەشدا، ئەو شاعیرە گەورە و ڕۆشنبیرانە، تەبای «سەرکردایەتی» چوونەتە دەست لەملانێی سەرکردایەتیی حیزبە ڕەقیبەکە و دەیان بوتڵە قەل و شەرابی لەعلی ڕومانییان لەبەرپێی هوتێلە بڵندەکاندا بۆ یەکتر سەربڕیوە.

کەواتە فەیلەسووفێکی یاخی و سەرازبەکی وەک مەسعوود مەحەممەد ڕاست دەکات کاتێ دەڵێ: «ئەو تەرزە ڕۆشنبیرانە لە ڕۆژگارێکدا کە خۆیان خەریکی خەباتی نهێنی دەبن هەموو پۆلیسی نهێنیی وڵاتەکەی خۆیان بە جاسووس دادەنێن، کەچی دووتر کە دەسەڵات دەگرنە دەست دەبنەوە جاسووس بەسەر غەیری تاقمی خۆیاندا».

بەپێچەوانەی هەڵوێستی ڕۆشنبیر و مامۆستایانی زانکۆ، دەبینین قوتابی و گەنج و خوێندکارانی زانکۆ، دەسپێشخەر، لە زۆربەی بەڵا و قەیرانە گورچووبڕەکاندا پێش هەموو توێژێکی دیکە لە پێشەوەدا بوونە: بۆ نموونە لە کاتی دەنگۆی لەشکرکێشییەکەی تورکیا بۆ ناو خاکی کوردستانی عیراق، لە کاتی زەبروزەنگی حکوومەتی فاشیستی سووریا بەرامبەر خەڵکی کوردی قامشلووی کوردستانی سووریا، لە کاتی جاسووس

دەرچوونی هەندێ لە ئەندامە بەرزەکانی ناو حیزبە دەسەڵاتدارەکان و هەندێ لە مامۆستایانی زانکۆ، لەکاتی هەڵوێست وەرگرتن لەهەمبەر کوردستانی بوونی کەرکووک، لەکاتی هەڵوێست وەرگرتن لەهەمبەر ستەمی کۆماری ئیسلامیی ئێران بەسەر خوێندکارە کوردەکانی زانکۆکانی تاران و سنە؛ لەکاتی تاڵانکردنی مۆزەخانەی هەولێر.. دەبینین ئەم توێژە چاونەترس و بێدارە، پێش حکوومەت و حیزب و سیاسەتمەدارەکان، پێش ڕووناکبیرەکان، تەنانەت پێش مامۆستاکانی خۆشیان لە زانکۆ دەسپێشخەر بوونە: یەکەمین توێژ بوونە کە نارەزایی و هەڵوێستی خۆیان نواندووە؛ چ بە مانگرتن یان بە خۆپیشاندان یان بە چالاکیی دیکە.. دووای ئەوان ئنجا توێژە ناوبراوەکانی دیکە -ئەمەش دووای وەرگرتنی ئیعاز لە حیزب- ڕێپێوانێکیان تا بەردەمی پەرلەمان کردووە! بۆ سەلماندنی ئەم قسانەم پێویست ناکا ڕۆژ و بەروار و نموونەی دیکە دەسنیشان بکەم. هەر کەسێکی بێدار لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی دووایی‌دا لە کوردستان ژیابێت، دەزانێ ئەمە پیاهەڵدان و زێدەڕۆیی نیە لە بەستێنی سەرازایی ئەم توێژە جەسوور و هەمیشە بێدارە!

جگە لە هەموو ئەمانەش، گەنج و قوتابی، بەپێچەوانەی پیر و مامۆستا (کە عادەتەن خۆی بە دەسەڵاتدار دەزانێت و لە تەمەنێکی هەڵکشاودایە) لەڕووی فیزیکەوە، بە سروشتی خۆی، ناوەڕۆکێکی ڕاچەنیو، سروشتێکی سەرازا و سەرەڕۆی هەیە. کەواتە، لەچاو پیر و مودیر و مامۆستا و مەلا و عەمیدەکان، بێگومان گەنج جەسوورتر، بێدارتر، یاخیگەرتر و سەرازاتر دەکەونەوە. بڕوانە نالی، چەن خاکەڕا و جوان بەراوردی گەنجێتی و پیرێتی دەکا:

ئەو پیری خەرەف، ئافەتی مەردێ و صەفا بوو
تۆ شۆخ و جوان، دوور بی لە ئافات و خەرافات

هەر قۆناغێکی دیاریکراوی تەمەن خاوەن خاسیەتی تایبەتمەندی خۆیەتی: پیر، کە تاقەتی نەماوە، حەزدەکا دانیشێت و ئیسراحەت بکات و بکشێتەوە؛ منداڵ ورک دەگرێت و جارجار کەمێک یاخی دەبێت؛ گەنجیش - لە نەوجەوانێتی و خوێندکارییەوە تا دووای تەواوکردنی زانکۆش -

فیزیک و سروشته تایبەتمەندەکەی، ئەو خاسیەتەی بێ دەبەخشێ کە هەمیشە حەزبکات یاخی ببێت و جەربەزەیی بنوێنێت و عاشق بێت، ئەو هێزە مەزنەی پێ دەبەخشێت کە بتوانێ موغامەڕات بکات و سەرکێشی بکات و هاوار بکات و چێژێکی بێ پایان لە هەرچی شتێکدا ببینێت کە بوونی خۆی تێیاندا وەدی دەهێنێ - بام هەرا و هەڵە و وێرانکردنیش بێت!

ئەم ئارەزووی یاخیبوون و جەربەزەییە لای گەنج، لەوکاتەدا دەگاتە چڵەپۆپە کاتێ عاشق دەبێت و بواری مومارەسەکردنی ئەو عەشقەی -بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێ- لێ سەندراوەتەوە..

عاشقبوون تەنێ لە هەرەتی گەنجێتیدا دەبێ، گەنجیش ئیتر لەم کاتی عاشقبوونەدا جۆشێکی داهێن و خرۆشێکی یاخیگەر پەیدا دەکات، وەک مەحوی دەڵێ:

لە بەردەرگاهی عیشقا یەکسەرە هەر کەس سەری دانا
ئەگەر پەتیارەیەک بوو، بوو لە سەد عەللامە داناتر

کەواتە، من واتێدەگم، یەکێک لە هۆکارەکانی ئەوەی ک قوتابیی ئێمە هەمیشە لەسەرپێ و یاخی و تووڕە و بێزارن دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دڵیان دەرهێندراوە، بواری ئەوەیان لێ سەندراوەتەوە کە ویست و هەوەس و ئاوات و ئارەزووەکانی خۆیان مومارەسە بکەن! ئەم بێبەری بوون و کەموکورتییەش، بێگومان، بەتەنیاش بێ، هۆیەکی کیفایەتە بۆئەوەی خوێندکاری زانکۆ و گەنج بیانەوێ تووڕە بن و ڕاپەڕن، بیانەوێ دنیا بگۆڕن و بکەونە ناو شەقامەکان هاوار بکەن:

گوو لە کۆمەڵگە دەکەم .. ئنجا دڵم خۆش دەبێ.
«پیرۆز» دوژمنی ئێمەیە.
کەمێک بە گوێ نەکردن، دەبێتە زۆرێک دەسکەوت
مێشکتان و زنجیری پانتۆڵەکانتان.. بکەنەوە!
با قەدەغەکردن قەدەغە بکرێت!

لە هەموو وڵاتێکدا جیلێک دەمرێ بۆ ئەوەی کتێبێکی باش لە دایک ببێت. بەڵام لە کوردستانی ئازادی دووای صەدام حسێن دا وا پازدە ساڵ

زیاتره نەسلە پیرەکەی ڕابردوو یان ڕۆشنبیرەکانی نەوەی پێش ڕاپەڕین -بە هەموو مامۆستاکانی زانکۆشەوە - هیچ کتێبێکیان بڵاونەکردۆتەوە کە گێچەڵێک بۆ دەسەڵات یان بۆ نەریتەکان بنێتەوە؛ یان ڕۆحیات و ئەقڵ و فەلسەفە و ئەخلاقی سەردەمەکەی خۆی هەڵوەشاندبێتەوە و خستبێتنیە ژێر پرسیارەوە؟

ئایا ئەمە واتای چی دەگەیەنێ؟ واتای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو جیلەی پێشوو، بە مامۆستایانی زانکۆ و ڕۆشنبیرانیشەوە؛ هیچ یەکێکیان لەناو ڕووداوەکاندا نەژیاون و بیریان نەکردۆتەوە؟! ئەمە لەکاتێکدا زۆربەی ئەو وتار و ڕیپۆرتاژ و کتێبە بەهادار و بێدارانەی دەنووسرێن، زۆربەی ئەو بزاف و کار و چالاکییە دیارانەی هەن، هی ڕۆشنبیرە گەنجەکانن، هی ئەو قوتابیانەن کە ناسنامەیەکی ڕۆژنامەنووسانەیان لە باخەڵدایە و تەنێ ئەو گەنجانەشن زۆر جاران -لەناکاو- برادەرە گەنجەکانیان لێفە و دۆشەگ یان شووتییەکی گەرمیان بۆ دەبەنە بەندیخانەکانیان، کاتێ لەسەر ڕیپۆرتاژێکی جەسوور لەبارەی فەسادی ئیداری چەند شەوێک تەوقیف دەکرێن.

کەواتە، ئاشکرایە، هەڵوێستی مامۆستایانی زانکۆ لە هەڵوێستی کرێکاران و جوتیاران و ڕۆشنبیران بەربادتریشە. جگە لەمەش، ئەم توێژەی مامۆستایان، وەک ڕۆشنبیران، خودی خۆیان بەشێکن لە دەسەڵاتە مەعریفییە کۆن و پیرەکەی فەرمانڕەوا، واتە بەشێکن لە دەسەڵاتە کارگێڕییەکەی گەنج و خوێندکارانیان بەستۆتەوە. بەکورتی: چاوەڕێی ئەوە نەبین بەهیچ شێوەیەک کە ڕۆشنبیر و مامۆستای زانکۆی نەسلی ڕابردوو بێن مەعریفەیەکی یاخی و ئەپستمۆلۆژیایەکی هاوچەرخ و ڕەخنەگر فێری گەنج و قوتابیان بکەن، وەک حاجی قادری کۆیی دەڵێ:

دەستگیریت لە عەمەلدا قەت نەکا مورشیدی پیر
دەستی تۆی گرتووە، پێی بەستووی مانەندی ئەسیر!

## بزاڤی «گەنجە کوردەکان» و ڕێکخراوی هێڤی

## لەگەڵ بزاڤی ئەمڕۆی گەنج و قوتابیان

## چۆن بەراورد دەکرێ؟

ڕاپەڕینی «گەنجە کوردەکان» کە دامەزراندنی ڕێکخراوی خوێندکارانەی (هێڤی) لە ١٢-١٩١٣ تەنیا پەنجەیەکی بچووکی بوو، ڕێنسانسێک بوو؛ تا ئێستا هاوتای دروست نەبۆتەوە.. لەو کاتەوە تا ئێستا لە هیچ قۆناغێکی مێژوومانداا نەبیندراوەتەوە. بۆیە بەراوردکردنی بە دۆخی ئەمڕۆمان، تەنیا لە بەستێنی چەند تێبینییەکدا دەمێنێتەوە:

ڕاپەڕینی «گەنجە کوردەکان» ڕێنسانسێکی کولتووری و کۆمەڵایەتی و تەکنیکی و سیاسیی مەزن بوو لە ئاستی هەموو کوردستانی گەورەدا، کە سەرەتاکەی بە چەند قوتابی و گەنجێکی ئاوارەی ئەستەمبوڵ دەستی پێکرد، واتە چەند خوێندکار و گەنجێکی ڕۆشنبیری وەک د. عبدالله جەودەت و پیرەمێرد و عبدالرحمن بەدرخان و ژەنەراڵ شەریف پاشا و د. کامەران بەدرخان و حسێن حوزنی موکریانی و چەندێکی تر(لەوانەیە بەتەمەنترینیان حاجی قادری کۆیی بووبێ) بناغەی ئەم ڕێنسانسەیان دامەزراند.

هەموو ئەم ڕێنسانسە، بە پارە و پووڵی شەخسیی خودی ئەم گەنج و خوێندکارانە هاتە دی، تەنانەت کرینی چاپخانەکان و دروستکردنی قوتابخانەکانیش بە پارەی باخەڵی خۆیان بوو: هیچ حکومەتێک و وەزارەتێک لەپشت ئەم ڕێنسانسەوە نەبووە. ئەمەش بەپێچەوانەی هەموو ڕێنسانسێک لە دنیادا کە هەمیشە پێویستە دەوڵەتێک کۆمەکیان بکات. هەروەها ئەمە لە هەمان کاتدا پێچەوانەی دۆخی ئەمڕۆیشە، کە بزاڤی خوێندکاران و لاوانی ئەمڕۆ حکوومەتی هەرێم کۆمەکیان دەکات. ئەمەش،

دیسانەوە، خۆڕاگری و باوەڕ و هێزی ئەو نەسلە لەخۆبردووە بوێرەی ڕابردوو دەردەخات کە -بە پارە و پووڵی خۆشیانەوە- چەند سوور بوونە لەسەر خەبات!

بزاڤی خوێندکار و لاوانی ئەوکاتە بزاڤێکی وەک گوتمان سەرتاپایی بوو، خۆیان هەڵدەقورتاندە هەموو بەستێن و بوارێک (سیاسی، کۆمەلایەتی، کولتووری، چینایەتی، دینی..هتد)، دەیانویست گۆڕان لە هەموو ئەم بوارانەدا ساز بکەن و تەنیا بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان کار نەکەن (بێگومان هەر بۆیەش توانییان ئەو ڕێنسانسە بێ هاوتایە لە مێژووی کوردستاندا تۆمار بکەن)؛ بەڵام بزاڤی قوتابیان و لاوانی ئەمڕۆی کوردستانی عیراق، تەنیا لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی خوێندکاران دەسوورێتەوە و خۆیان نادەن لە قەرەی گرفتەکانی غەیری خۆیان؛ لەمەش بەدبەختانەتر کار زیاتر لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی قوتابیانی سەر بە یەک حزب دەکەن. ئەم خاسیەتەش نەنگترین و خراپترین خاسیەتی ئەم بزاڤەیە و لەم ڕووەوە پێویستە ئەم بزاڤەی ئەمڕۆ، ڕەخنەیەکی زۆر توند لە خۆی بگرێت، چونکە:

١- ئەم بزاڤە ئەمڕۆ کار تەنیا لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی توێژی خۆیان (لاوان و خوێندکاران) دەکەن. خۆیان هەڵناقورتێننە کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و چینایەتی و گرفتەکانی دیکەی بۆ نموونە لە بەستێنی ژیانی سێکس و دەستوور و بەرهەمهێنان و بووژاندنەوەی ئابووریی نیشتیمانییەوە دێنە پێشەوە.

٢- بزاڤەکە خۆی بەسەر دوو ڕێکخراوی سەرەکی، (قوتابیان) و (خوێندکاران)، دابەش کردووە، جگە لە ڕێکخراوی خوێندکارانەی حزبەکانی دیکە (فێرخواز) و (گشتی) و .. هتد.

ئەمە مانای وایە بزاڤەکە خاسیەت و ناوەڕۆکێکی حزبایەتیانەی هەیە، هەر یەکێکیان وەک ئامرازێک وان -نەک وەک شەخسیەتێکی زیندووی سەربەخۆ- کار لەپێناو بەرژەوەندی و ئامانجەکانی تەنێ حزبێک دەکەن.

ئەم حیزبی بوونەی ڕێکخراوە خوێندکاری و گەنجانەکانی ئەمڕۆی کوردستان، ئەم لایەنە خراپانەی هەیە:

- هەر یەکێک لەم ڕێکخراوانە سیفەتی عەشیرەتێکی وەرگرتووە، خاسیەتی هۆزێکی سەدەکانی ناوەڕاستی وەرگرتووە. تاکەکەس تێیاندا دەنگی خنکاوە، پەیوەندیدارە بە نەریتی هۆزەکەیەوە. عەشیرەتەکەی (واتە ڕێکخراوەکەی) داوای لێدەکات هەمیشە هاوچوونی ئەندامانی دیکە بێت؛ ئەمە لەکاتێکدا ڕێکخراوی خوێندکاری و گەنجانە پێویستە لەپێناو تەقاندنەوەی هەستی تاکەکەسیانەی ئەو تێبکۆشێت، ڕێگەی بۆ خۆش بکات تاک و ئازاد بژیت، داوای ماف و ئازادییەکانی خۆی بکات؛ یاخی ببێت لەدەست نەریت و چوارچێوەکان: نەک بەپێچەوانەوە.

بۆیە من پێم وایە، تاکو ئێستاش سیستەمی هەر هەموو ڕێکخراوەکان بریتیە لە هەمان سیستەمی عەشیرەت و هۆزەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بەڵام لە جلوبەرگێکی نوێدا.

بەکورتی، من دەمەوێ ئەوە بە گەنج و قوتابیان بڵێم:

ئینسانی گەنج یان خوێندکاری مەرد کاتێ تووڕە دەبێت و دەیەوێ یاخی ببێت نابێ منەتی بە هیچ حکوومەت و عەشیرەت و باوک و باپیران و براگەورەیەک بێنێ. وەک دیکارت دەڵێ: «من نامەوێ تەنانەت ئەوەش بزانم ئاخۆ پێش من خەڵکی تر هەبوونە یان نا؟!».

گەنجی یاخی یان قوتابییەکی سەرازا کاتێ دەیەوێ کردەوەیەکی مەردانە و سەرازا لەپێناو گۆڕانسازییەک بنوێنێ نابێ پرسیار لە حزبەکەی خۆی بکات: مەگەر تەنیا ئەوە نەبێت بچێ قەناعەت بە هاوڕێ و هاوئازارەکانی دیکەیشی بهێنێت.

- ئەم حیزبی بوونەی ڕێکخراوەکان وای کردووە هەر یەکێک لەم ڕێکخراوانە (لە هەموو ڕوویەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتوورییەوە) خاوەن سەربەخۆیی و بڕیاری سەربەخۆی خۆیان نەبن، ئازاد نەبن لە ڕەفتار و بڕیار و چالاکییەکانیاندا. بۆ نموونە ئەگەر حزبەکەی گوتی (نابێ لە کانی وەقمان بەملاوە بڕۆی، نابێ بڕوا). وەک لە سەرەوەدا باسمان کرد تەنانەت هیچ یەکێک لە تاکەکان و ئەندامەکانیش نابێ بڕۆن! ئەمەش

چونکە، وەک فەیلەسووفی سەرازای کورد، مەسعوود محەممەد دەڵێ: «مرۆی سیاسی بەزۆری قسەیەک دەکوتێتەوە کە لەگەڵ بەرنامەکەی خۆیدا بڕوات.» نەک لەگەڵ بەرژەوەندی و ئازادی و دۆخی تاکەکەسەکان و تەنانەت هەموو کۆمەڵگاش!

بۆ نموونە لە کاتی جەنگی براکوژیدا کە چەندین ساڵی خایاند، هیچ یەکێک لە دوو ڕێکخراوە خوێندکاری و قوتابییانە سەرەکییەکە نەک هەر ڕۆڵیان نەبوو لە ئاشتکردنەوەی ئەو دوو حیزبە، نەک هەر نەهاتن بە خۆپیشاندان قورساییەک بۆ سەر دوو حیزبەکە دروست بکەن لەپێناو ڕاگرتنی شەڕ، بەڵکو لەئەنجامی پابەندبوونیان بە بڕیارەکانی سەرکردایەتیی دوو حیزبەکە چەند لاپەڕەیەکی ڕووزەرد و شەرمەزاریشیان لە مێژووی بزاڤی خۆیاندا تۆمار کرد.

لەوانەیە ئێستا ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێک لەو ڕێکخراوانە لێم بێتە گۆ و گاڵتە بەم قسانەم بکات و بڵێ «باشە، بەڵام لە هەموو دنیادا و لە فەرەنساش هەر حزبێک ڕێکخراوێکی قوتابییانە یان گەنجانەی خۆی هەیە».

ئەگەر هەر حزبێک هەشبێت، ئەوا ڕێکخراوە گەنجانە یان خوێندکارییەکەی، لەگەڵ هەر ڕێکخراوێکی دیکەی حیزبێکی دیکەدا هاوپەیمان و هاوئازار و هاوئامانجن، لەوەدا یەک دەگرنەوە کە ئەوان هەموویان بەرگری لە یەکییەتیی بەرژەوەندییەکانی گەل دەکەن (بۆیە لەو وڵاتانەدا هیچ ڕێکخراوێکی خوێندکاری و گەنجانە ئەوە لە حیزبەکەی خۆی قەبووڵ ناکا -لە هیچ دۆخێکدا- ڕۆڵەکانی گەل یان تەنانەت ئوتومبێلێک و .. بزنێکیش ببێتە قوربانیی جەنگێکی براکوژی). ئەمە لەڕووی سیاسییەوە. لەڕووی ڕێکخراوەییشەوە، هەر ڕێکخراوێک تێیدەکۆشێت لەپێناو بووژاندنەوەی ڕەهەندە تاکەکەسی و خوێندکاری و گەنجانەکانی ئەو توێژە، نەک خۆکردنە دەسکەلای ئەو حیزبە و ماستاوساردکردنەوە بۆ مەکتەبی سیاسیی ئەو حیزبە.

بۆیەش من پێم وایە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا کێشەی حزبایەتی و شەڕی چەکداری کەمتر بێت و پێکەوەژیانی ئاشتیانە بەرقەراربووبێت، ئەوا خوێندکاران و گەنجان باشتر دەتوانن خۆیان سازبدەن لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆیان. چەند زیاتر دیموکراسی بەناو کۆمەڵگەدا ڕۆبچێت، هێندە زیاتر قوتابیان و لاوانیش بەرەو پێشەوە هەنگاوی جوانتر و گەشتر دەنێن. ئەم ڕێکەوتنەی ئەم دووایییەی یەکیەتی و پارتی و دامەزراندنەوەی پەرلەمان، کە بێگومان بەرەو چەسپاندنی ئاشتی و دیموکراسی هەنگاو دەنێت، بە بۆچوونی من: سەرەتایەکی تازە دەبێت لە ڕاستەڕێی خەباتی قوتابیان و لاواندا.

لەوانەیە ئێستا دیسان ئەندامی سەرکردایەتیی ڕێکخراوێکی دیکە لێم بێتە گۆ و هەر سەبارەت بەم قسانەی پێشوومەوە کە گوتبووم (هیچ ڕێکخراوێک سەربەخۆ نیە و پووڵ لە حزبێکەوە وەردەگرێ)؛ لێم بپرسێ:

- باشە، لە هەموو دنیادا و لە فەڕەنساش هەر ڕێکخراوێک، ئەگەر بۆدجەکەی لەو حیزبەوە و بەهۆی ئەو حیزبەوە وەربگرێت، ئایا نابێت وەفای بۆ ئەو حیزبە هەبێت و گوێڕایەڵی بێت؟

لە وەڵامدا - دەبێ بزانین: بەپێی قانوونی هەموو دەوڵەتێکی دیموکرات و نیمچە دیموکرات، هەر پێنج یان پازدە کەسێک ئەگەر کۆببنەوە و ویستیان ڕێکخراوێک یان سەنتەرێک دروست بکەن، مافی خۆیانە و بۆیان هەیە بیکەن و بۆدجەیەکی مانگانەشیان بۆ تەرخان بکرێت. لە لایەکی دیکەشەوە، دیسان، لە قانوونی هەموو دەوڵەتێکی دیموکرات و نیمچە دیموکراتدا: حکوومەت بڕێک پارەی دەسنیشانکراوی تەرخان کردووە بۆ بۆدجەی ڕێکخراوە جۆراوجۆرە ناحکوومەتییەکان. ئەم پارەیە پارەی هیچ حیزبێک نیە بەتەنیا، پارەی گەلە، لەڕێگەی حکوومەتەوە - ئیتر ماوەیەک ئەم حکوومەتە پارتی بەڕێوەی دەبات و ماوەیەکی دیکە یەکیەتی یان کۆمەڵ یان حزبی شووعی، فەرقی نیە بۆ ڕێکخراوەکە -.

کەواتە بۆچی دەبێ خوێندکاران یان لاوان کاتێ ڕێکخراوێک یان سەنتەرێک بۆ بەرژەوەندییە گشتییەکانی خۆیان دادەمەزرێنن پێویستە تا

هەتایە سوپاسی یەکیەتیی نیشتیمانیی کوردستان بکەن و مننەتباری بن لەبەرئەوەی مۆڵەتی پێ داون و بۆدجەیەکی مانگانەی بۆیان بڕیوەتەوە؟ یان بۆچی پێویستە لە پاداشتی ئەوەدا تا هەتایە لە خزمەتی بڕیارەکانی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بن؟! خۆ ئەو بۆدجەیەی بۆ چالاکییەکانی ڕێکخراوەکە تەرخان کراوە هیچ یەکێک لەو گەنج و قوتابیانە نەچوونە بەو پارەیە مایەسیریی خۆیانی لە لەندەن پێ چاک بکەنەوە؟! نەچوونە ژنی دوومی پێ بێنن وەک ئەندامی مەکتەبی سیاسیی هەندێ لە حیزبەکان دەیکەن.

کەواتە پێویست وایە:

– خوێندکاران و لاوان هەرگیز بەم هەستی کەمی شەرمەزاری و مننەتبارییەوە کار نەکەن و چیتر واتێنەگەن کە ئەم پارە و بۆدجەیەی لە حکوومەتەوە بۆ سەنتەر یان ڕێکخراوەکەیان دێت، سەدەقە و زەکات و خێری فلان حیزبە؛ بەڵکو پارەی گەل و سامانەکانی ئەم نیشتیمانەی خۆیانە و بەپێی قانوونێک کە لە پەرلەمانەوە دەرچووە، کاری پێ دەکرێت.

– پێویست وایە ئەم بۆدجەیەی دەدرێتە سەنتەر و ڕێکخراوەکان، تەنیا لە حکوومەتەوە بێت؛ واتە پێویستە حزب دەسەڵاتی ئەوەی لێ بسەندرێتەوە کە بۆدجە بۆ سەنتەر و ڕێکخراوەکان ببڕێتەوە.

– پێویست وایە، لەمەودووا ڕێکخراوەکان لەوە ئەرخایین بن کە ئامانجەکانی ڕێکخراوەکەیان لەپێناو بەرژەوەندییە گشتییەکانی تاکەکانی ئەو توێژەیە کە ڕێکخراوەکەی لەپێناو دامەزراوە، لەپێناو زەمینەخۆشکردنە بۆ پراتیک کردنی ئازادییەکان و مافەکانی گەنجان و قوتابیان؛ نەک لەپێناو پاداشت دانەوەی ئەو حیزب و حکوومەتەی کە بۆدجەکەی بۆ بڕیونەتەوە.

بێگومان تەنیا و تەنیا لەم کاتەشەوە هەر ڕێکخراوێک دەتوانێ هێز وبڕستی خەبات پەیدا بکات کە سەربەخۆ و ئازاد بڕیار بدات و کار بکات.

- ئەم حیزبی بوونەی ڕێکخراوەکان، خەوشێکی دیکەیشی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ژمارەی ئەندامان و لایەنگرانی کەم دەکاتەوە: تەنیا ئەو کەسانە لایەنگیر و ئەندامی دەبن کە سەر بەو حیزبەن کە کۆمەکی ڕێکخراوەکە دەکات. لەم کاتەشدا ئەو ڕێکخراوە، با ئامانجی بەرز و جوان و مەزنیشی هەبێت، بەڵام مەکزیمەمی لایەنگرەکانی بریتی دەبن لە مەکزیمەمی لایەنگرە حیزبییەکانی.

ئەمەش مانای وایە ئەم حیزبی بوونەی ڕێکخراوەکان، توێژی لاوان و خوێندکاران تووشی پارچەپارچەیی دەکات؛ هێزی قوتابی و گەنج هەڵمدەمژێت و کەمی دەکاتەوە. ناهێڵێ پشتی یەکتر بگرن و لە کاتە چارەنووسسازەکاندا بەڕاستی لەیەکتر کۆببنەوە و داخوازییەکانیان سەربگرێت. چونکە هەر یەکێکیان لە ئاشێک دەکات و هەر یەکێکیان بەجیا بەرەو ئاراستەیەک دەڕوا و هەر یەکێکیان بەجیا لە شوێنێکی جیا کۆدەبێتەوە.

هەر ئەمەشە هۆی ئەوەی کە تا ئێستا ڕاپەڕینێکی سەرتاپاگیر، گۆڕانسازییەکی سەرتاپاگیر هەموو کوردستانی نەگرتۆتەوە: چونکە تا ئێستا توێژی گەنج و قوتابی نەیانتوانیوە ببنە قورساییەک و هێزێک بۆ سەر حکومەت، تەنانەت نەیانتوانیوە یەک نوێنەریشیان نەک هەر لەناو پەرلەماندا بەڵکو نەیانتوانیوە نوێنەریان لەناو ئەنجوومەنی هیچ زانکۆیەک و تەنانەت لەناوئەنجوومەنی هیچ بەڕێوەبەرایەتیەکی بەرپرسیش هەبێت.

هەمیشە، بۆئەوەی داخوازییە هەمەکییەکان جێبەجێ بکرێن، پێویستە ئەو ڕێکخراوەی داخوازییەکان دەردەبڕێت هوشیارییەکی باشی لەبارەی یەکێتیی تاکەکانی خۆیەوە هەبێت؛ پێویستە هەوڵبدات کۆیان بکاتەوە یەکڕیزیان بکات بۆئەوەی یەکهێز بن، یەکدەست بن! نەک پەرتەوازە و بێهێز.

- ئەم حیزبی بوونەی ڕێکخراوەکان، بیری ئەندامانی ڕێکخراو تووشی کلێشەگەرایی و ڕەقهەڵاتن دەکا، هەروەها فیزیکی ئەندامانی ڕێکخراو

دەکوژێت.

هەمووممان دەزانین حیزب بیرکردنەوەی ئینسان لە چوارچێوەی خۆیدا بەند دەکات. ناهێڵێ ئازادانە بیر بکاتەوە: حیزب چۆنی بیر کردەوە، ئەویش دەبێ بە هەمان شێوە بێت! هەر بۆیەش دەبینین لە کوردستانی ئازادی دووای ڕاپەڕیندا - سەرەڕای نەمانی بەعس- قوتابیان و لاوان تەنانەت ڕووناکبیرانی گەورەش بڕیار و ئیرادەی خۆیان سپاردۆتە حزبەکان. ئەمە دوو لێکدانەوە هەڵدەگرێ:

١- حزبەکان توانیویانە بڕیار و ویست (ئیرادە) لە لاوان و خوێندکاران و ڕۆشنبیران بسێننەوە.

٢- قوتابی و گەنج و ڕووناکبیرانیش بە ڕۆڵی خۆیان، تاقەتیان نەماوە، چارەنووسی خۆیان و گەلەکەیان سپاردۆتە دەست بڕیار و ویستی مەکتەبی سیاسیی حیزبەکانەوە.

کەواتە، ئەمەیە هۆی ئەوەی کە ئەمڕۆ (تاکەکەس) ڕۆڵ و بەها و ئازادی و سەنگی نیە و نەماوە: حیزب لەجیاتی ئەو بیردەکاتەوە.

کەواتە، ئەمەیە هۆی ئەوەیش کە ئەمڕۆ (یاخیبوون) نیە: حیزب- خۆی لەجیاتی ئەوان یاخی دەبێ.

بەم شێوەیە، لە سۆنگەی ئەوەی کە حیزب بیرکردنەوەی تاکەکەسیانە و بیرکردنەوە لە یاخیبوون دەکوژێت، کەواتە مانای وایە بیرکردنەوەش نامێنێت (تەنانەت لەناو پەرلەمانیشدا). یاخیبوون -کە جەوهەری پێشکەوتنی تاکەکەسە- لەبەین دەڕوات و نامێنێ؛ چونکە یاخیبوون- هەمووممان دەزانین- لەوکاتەدا دەست پێدەکات کە «من» بیری کردەوە.

ئەمەش مانای وایە کە ئێمە، لەمێژووی خۆماندا، دەبین بە سەردەمێکی بێ یادەوەری؛ سەردەمێک کە هیچ پێشبینی و مومکیناتێکی لێوە لەدایک نابێ.

لەبارەی کوژرانی فیزیکی ئەندامانی ڕێکخراویشەوە، دەزانین یاخیبوون ڕەهەندێکی فیزیایی هەیە. تۆ سەیرکە، تەنانەت منداڵ یان نەوجەوان ئەگەر یاخی نەبێت (بەرامبەر باوک، دایک، قوتابخانە..هتد) ئەوا ناتوانێ

بگاته خودی خۆی و سەربەخۆ بێت، ناتوانێ داهێنەر بێت؛ ناتوانێ تەنانەت گەورەش ببێت. کەواتە، هەر کۆمەڵگەیەک یان حزبێک ئەگەر نەوجەوان و گەنج و قوتابی لە چوارچێوەی خۆی بدات یان سانسۆر بخاتە سەر یاخیبوونەکانیان، ئەوا چاڵی مردن بۆ خۆی و بۆ ئەو نەوجەوان و خوێندکارانە هەڵدەکەنێ. چونکە کە خەون و ئارەزووە تاکەکەسییەکان، یان کاتێ بڕیاری تاک و ویستی تاکەکەس نەمێنێ، تاکەکەس -خۆیشی نامێنێ.

بەم شێوەیە تاکەکەس (گەنج، قوتابی، ڕۆشنبیر) لە وڵای ئێمەدا، بەردەوام دەژی، بەڵام ئیمازی (بیرۆکەکەی لەبارەی خۆی) نەماوە. ئەمەش - بەڕای حیزب - مردنێکی تراژیدی نیە، بەڵکو مردنێکی شکۆمەندانەیە، لەپێناو گەل و شەهیدبوونە. خۆبەختکردنە لەپێناو عەشیرەت و حزب و گەل.

جیاوازییەکی دیکەی نێوان بزاڤی «گەنجە کوردەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم» لەچاو هی ئەمڕۆ لەوەدایە کە ئەوان چەندین دەروازەی کولتووری ڕۆژئاواییان بەسەر خۆیاندا کردبۆوە، بەتایبەتی دەروازەی ئەستەمبۆڵ و ئەورووپا، توانیبوویان خۆیان فێری چەندین زمانی ئەورووپی بکەن (بۆ نموونە: د. کامەران بەدرخان: ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی؛ د، عبدالله جەودەت: فەرەنسی و ئینگلیزی؛ عبدالرحمن بەدرخان: ئەرمەنی و فەرەنسی؛ میقداد- مەدحەت بەدرخان: فەرەنسی؛ ژەنەڕاڵ شەریف پاشا: ئیتاڵی و فەرەنسی و ئینگلیزی، حسین حوزنی موکریانی: ڕووسی و ئینگلیزی و فەرەنسی؛ ع. ڕ. هەکاری: ڕووسی و ئەڵمانی؛ مەمدووح سەلیم: فەرەنسی...). ئەم زمانانەیان بەکاردەهێنا بۆ بووژاندنەوە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکەی ژیانی کورد. ئەمە لەکاتێکدا خوێندکار و لاوانی ئەمڕۆ، خەریکە زمانی عەرەبییەکەشیان لەبیر دەچێتەوە: لە کوردی زیاتر هیچ زمانێکی دیکە نازانن، مەگەر بەدەگمەن نەبێ، هەندێکیان کەمێک فارسی یان کەمێک عەرەبی بزانن.

جیلێکی نوێ، له قوتابیانی سەرەتاییەوە تا زانکۆ، له ئێستاوه دروست بووه که عەرەبی نازانێ. ئەمەش چونکه ئەمڕۆ له کوردستاندا زمانی عەرەبی وەکو جاران لەناو دەزگا و تەلەڤزیۆن و ڕادیۆ و قوتابخانه و زانکۆکاندا بالادەست نیه. ئەم دوورکەوتنەوەیه له زمانی عەرەبی، به بۆچوونی من، دیاردەیەکی زۆر خەتەرناکه چونکه تاکو ئێستا ئێمه ئەلتەرنەتیڤی زمانی عەرەبی و کولتووری عەرەبیمان نەدۆزیوەتەوە! وازهێنان له کولتوور و زمانی عەرەبی، قەیناکه: بەلام ئەدی نابێ بیر له دۆزینەوەی زمان و کولتوورێکی دیکه بکەینەوە؟ ئەدی نابێ بیر له هێنانەئارای مێتۆد و مەنهەجێکی تازەی کار و خوێندن و ڕۆشنبیری بکەینەوە؟ ئەم کاره وەک ئەوه وایه که تۆ له ژوورێکدا بژیت و تەنیا یەک پەنجەرەی هەبێت و بێیت ئەو پەنجەرەیەش دابخەیت. ئیتر ئاشکرایه، تۆ له ژوورێکی داخراوی بێ پەنجەرەدا دەخنکێیت، بۆگەن دەکەیت!

من واتێدەگەم، ئەم جیله نوێیەی ئەمڕۆ، ئەگەر ئاوها بەردەوام بێت و هیچ گۆڕانێک له مەنهەجی کتێبه پەروەردەییەکان نەکات و هیچ میکانیزمێکی نوێ بۆ فێربوونی زمانی ئەوروپی وەدەست نەهێنێت، وەک دەڵێن «له قەلانیش دەبێت و له کۆترانیش دەبێ»؛ واته هەم زمان و کولتووره عەرەبییەکەیان لەدەست دەچێت، هەم دەستیان بەو کولتووره ڕۆژئاواییەش ڕاناگات که خەونی پێوه دەبینن!

حەیف لەوەدایه تاکو ئێستا، سەرەڕای ڕابووردنی پازده ساڵ بەسەر ڕاپەڕیندا، وەزارەتی پەروەرده و ڕۆشنبیری و زانکۆکان و ئەکادیمیاکان، هیچ یەکێکیان به هیچ شێوەیەک بیریان لەم کێشه خەتەرناکه نەکردۆتەوە و هەستیان به مەترسیی ئەم مەحروومیەته کولتوورییه نەکردووە. پێویستیی گۆڕینی مەنهەج و ناوەڕۆکی کتێبەکانیش (له سەرەتاییەوە بکه تا قۆناغی زانکۆ ئەوا هەر هیچ!). ئەمەش ئەوه دەگەیەنێت که تاکو ئێستا هیچ وەزیرێک و ئەکادیمییەک و سەرۆک زانکۆیەک و سەرۆک کۆڕی زانیارییەک له ئاستی ئەرک و ئەمەکه زانستی و ڕۆشنبیری و پەروەردەییەکاندا

نەبوونە؛ هیچ یەکێکیان نەیانتوانیوە پەی بەوە ببەن کە کۆمەڵگە نوێیەکە و نەسلە تازەکە چ جۆرە کێشە و گرفت و ئاوات و پێداویستییەکیان هەیە!

بەم شێوەیە، دەبینین، هیچ یەکێکیان، هیچ بەرنامەیەکی رۆشنبیری و زانستی و پەروەردەیی و زانکۆیی هاوچەرخی ئەوتۆی پێ نەبووە کە لە بەستێنی پێداویستی و هەلومەرجە تازەکەی کۆمەڵگەی دووای راپەڕیندا پیادەی بکات. هەر وەزیرێک و سەرۆک زانکۆیەک و سەرۆک کۆڕێکی زانیاریی تازە کە هاتووە، تەنیا دیواری بینایەکەی بە بۆیەیەکی تازە و بە رەنگێکی دیکە بۆیە کردۆتەوە و شوفێرێکی خزمی خۆی بۆ لەیلا عەلەوییەکەی داناوە و چەند پاسەوان و فەرمانبەر و حیمایە و سکرتێرێکی تازەی - لە خزم و کەسوکاری کاری خۆی - لەجیاتی پاسەوان و فەرمانبەر و سکرتێر و حیمایەکانی پێشوو داناوە؛ ئەوپەڕی ئەگەر شتێکی تازەی کردبێت: برادەرێکی یان خزمێکی خۆی لەجیاتی مودیرەکەی پێشووی فلان شوێن، تەعین کردووە.
بەداخەوە- خوێندکار و لاوانی دەستوپێ سپی و بێ دەسەڵات و بەستەزمانیش، هیچیان لەدەستدا نەهاتووە (لەئاستی گۆڕانکارییەکاندا) بیکەن: تەنیا هەندێکیان نەبێ کە بێن لە بۆنەکاندا ریز بن و چەپڵە بۆ «مقەست لێدانی وەزیر یان سەرۆکەکە لێ بدەن لەکاتی کردنەوەی پێشانگایەک یان لە کاتی دابەشکردنی خەڵات بەسەر چەند نووسەرێکی سەر رووتاوەی پیردا!».

که شێخ و واعیظ و صۆفی بە جەننەت بەن گەد و گیپاڵ
دەبێ ئەمسالی ئێمە بۆ جەهەننەم بەن سڕ و سیپاڵ

مەحوی



تیرۆر بەتایبەتیش تیرۆریزمی بزاڤە ئیسلامییەکان، بە هەر دوو لادا: تیرۆری جەستەیی و تیرۆری ڕۆشنبیری، کۆسپێکی دیکەیە لەبەردەم پێشکەوتنی ژیانی گەنج و گەلاڵەبوونی بزاڤی خوێندکاران.

تەقاندنەوەی شوێنە گشتییەکان و خزمەتگوزارییەکان و جێگاکانی دیکەی خۆشی و کات بەسەربردن و باخچەکان، یان تیزاب داکردن بە ژنان و کچانی سفووری ناو بازاڕەکان و ئەم جۆرە کردەوانە، وا لە خەڵکی گەنج و قوتابیان دەکەن چاوترسێن ببن و نەتوانن ژیانێکی سروشتی و ئاسایی بژین.

ئەو تیرۆریستە عارەبە موسڵمانە ڕاستەقینانە، هەموو شارەکانی خۆیان (لە مەغریبەوە بگرە تا دەگاتە میسر و ئیمارات و سووریە و ئوردن) یەکپارچە و سەرتاسەر پڕە لە مەلها و ڕاقیصەخانە و فەساد، کەچی ناچن لەوێ - لەولاتی خۆیان - گوللەیەکیش لە عارەبێک بدەن: ئەمە چونکە شاری خۆیانە و هاونەتەوەی خۆیانە؛ بەلام لە ولاتێکی وەک کوردستاندا کە ئەوپەڕی ئەخلاقی بەرز و جوانی تێدا فەرمانڕەوایە، یان لە شارێکی وەک هەولێردا کە یەکەمین شارە لە هەموو مێژووی دنیا و ئیسلامدا یادکردنەوەی لەدایکبوونی پیغەمبەری کردووە بە نەریت و عادەتێک، دێن لە ماوەی چاوترووکانێکدا دەیان پیاوی مەزنی وەک (شەوکەتی شێخ یەزدین) تیرۆر دەکەن کە تەنیا تاکەپێلاوێکی ئەو شەهیدە نەمرە ئیمانداره دەیان سەرکردەی وەک حافظ الاسد و فهد بن عبدالعزیز و شیخ زاید و حوسنی موبارەک دەهێنێ!

ئەم سیاسەتە تەنێ لەبەرئەوەیە کە شەهید شەوکەت و شەهید شاخەوان و ئەو هەموو سەدان شەهیدانەی دیکەمان و ئێمەی ڕۆڵەکانیان، کوردین و حەزمان لە ئازادیی نەتەوەییە و دەمانەوێ ئێمەش ئالای سەربەخۆی دەوڵەتێکی خۆمان هەبێت!

تیرۆر، کەواتە، هۆکارێکی دیکەیە قوتابی و گەنج دەگەڕێنێتەوە چوارچێوەی بەرگریکردن لە «حکوومەتە ساواکەمان» و ئابلووقەیان دەدات بە کۆت و پێوەندەکانی مەسەلەی «ئەمنی قەومی».

لێرەشەوە دەتوانین بڵێین: وڵات چەند لە تیرۆر و دەسەڵاتی تیرۆریستان زیاتر دوور بکەوێتەوە، ئەوەندە و زیاتریش خوێندکاران و گەنجەکان لە یاخیبوون و ڕاپەڕینی کۆمەڵایەتی نزیک دەخاتەوە.
مەسعوود محەممەد لەبارەی فەسادی تیرۆرستانی ئیسلامییەوە دەڵێ:

بێ ئەوەی بمەوێ دینداران زویر بکەم: بزووتنەوەکە بەرەو دەروێشایەتیی بێ پلان لە هەڵبەز هەڵبەزدایە. بارەها و جارەهاش چ گەشاییەکی عومەری عەبدولعەزیز و ئیمامی عەلی پێوە نامێنێ. بەپێچەوانەوە دڕندەیی بێلزووم و کوشتنی بێ دەسەڵاتان و بۆمباتەقاندنی شەقام و کۆڵانان بە جەڕ و مەنگەنەش نابردرێتەوە بۆ هیچ باوەڕ و ئامانجێکی پیرۆز. حاڵ گەیشتە ڕادەیەک ئیسلامییەکان لە پلەی گەیشتن بە دەسەڵاتی دەوڵەتی هەر لە تەمای دەوڵەتەکەوە یەخەی یەکتریان گرت. دەزانم تەعەسسووبی دینی و مەزهەبی و قادری و نەقشی و چی و چی بە بەریەوە هەیە لە حاڵەتی هەڵچووندا بە کوتەک هەڵکوتێتە سەر تانک و شێر و پڵینگ. هەر ئەم لایەنەی تێکەڵبوونی سیاسەت لەگەڵ دیندا وەها دەکات دوو لایەنی ئیسلامی لەسەر گەیشتن بە دەسەڵات، بە جۆرێک پاڵەوانێتی دژ بەیەکتر دەنوێنن کە هەرگیز لەگەڵ گومڕایانیان نەنوواندووە. بێگومان بەشێک لەو پارە و پوولەی بە شەڕکەرانی موسڵمان دەگات لە سەرچاوەی ناموسڵمانەوە دێت، تەنانەت دەوڵەتی ئیسلامیش هەیە بە ڕێدانی دەوڵەتی نائیسلام یاریدەی ئەم و ئەو دەدات.

ئەمە قسەی فەیلەسووفێکی دینداری دڵسۆزی کورد بوو، تەماشاکەن (دیارە پەتای تیرۆر بەناوی مەسیحیەتیشەوە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا ئامریکا و ئەورووپایشی گرتبۆوە) شاعیرێکی ئەو زەمانەی ئامریکا، والت

ویتمان، لەبارەی بەکارهێنانی مەسیحیەت و بەکارهێنانی کەنیسە دژ بە ئینسان (لە شیعرێکیدا بە ناونیشانی «واق ورمانی مندالێک» چ دەلێ:

لەبیرمە کە مندالّ بووم، ڕۆژانی یەکشەمە، هەمیشە
سەرسام
گوێم بۆ ئەو پیاوە ئاینییانە شل دەکرد
کە لە خوتبەکانیاندا ناوی خوایان دەهێنا
بۆ هیچ مەبەستێک نا
تەنیا بۆئەوەی بە گژ مرۆڤ و شکۆمەندیی مرۆڤدا بچنەوە.

لەگەلّ ئەمەشدا، مەسیحیەت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەورووپای لەدەست نابوودی و نالەباری ڕزگار کرد و تەنانەت لە ڕێنسانسیشدا مەسیحیەت ڕۆلێکی گەورەی هەبوو. ئەدی دەی با بزانین ئیسلام چیی بۆ کورد کردووە؟

دان بەوەدا دەبێ بنێین کە ئیسلام ڕێگر و کۆسپێک بووە لەبەردەم دروستبوونی دەولەتێکی کوردی و سەربەخۆیی کوردستاندا. کورد لەتاو ئیمانی خۆی و سەبارەت بە بەردەوام خزمەتکردنی عەرەب (لەبەر خاتری دینەکە) هەرگیز نەپرژاوەتە سەر ئەوەی بیر لە ئازادبوونی نەتەوەیی خۆی بکاتەوە. تەنانەت خودی صلاح الدین الایوبی ش، کاتێ دێت فەرمانێک دەربکات لەبارەی ئەوەی کە ئەرمەنییەکان مافیان هەبێت بە زمانی خۆیان بنووسن و بخوێننەوە و مافی کولتووری دەبەخشێتە گەلی ئەرمەن، ئەوا میللەتەکەی خۆی هەر بە خەیالێشدا نایە: دەبا هاتبا هیچ نەبووایە هەمان مافی کولتووری کە داویەتیە میللەتێکی فەلەی بێگانە بیدایەتە میللەتی موسلمان و هاوخوێنی خۆیشی! جودابوونەوە لە ئیمپراتۆریەتی عەبباسی و ئەییووبی و عوسمانی و صەفەوی بەوە لێک دەدرایەوە کە کورد دەیەوێ لە ئیسلام جودا بێتەوە. هەر وەک ئەمڕۆ: کاتێ دەمانەوێ باسی سەربەخۆیی کوردستان بکەین، بشار الاسد و حوسنی موبارەک و زەید بن فەهد یان ابراهیم بن قەحطانێکمان لێ قیت دەبێتەوە و دەلێن (کورد لە جوولەکە خراپترن و دەیانەوێ ئیسرائیلێکی دیکە لەو مەلبەندە دابمەزرێنن).

بەڵام لە هەمان کاتیشدا، ناکرێ ڕۆڵی مەزنی مزگەوت لە پێگەیاندنی شاعیرانمان نادیدە بگرین: سەرتاپای شاعیرانی کورد و نووسەرانی کورد، ئەگەر بە عەرەبی نووسیبێتیان یان بە کوردی، ئەوا لە مزگەوتەوە فێری خوێندەواری و شیعر و نووسین بوونە، هەر لە بابا تاهیری هەمەدانی یەوە (٩٣٥- ١٠١٠) بگرە تا حەریق (١٨٥١ ـ ١٩٠٧).
بەم شێوەیە مزگەوت نەک تەنیا و تەنیا بۆ نوێژ و تاعەت و دینداری بووە (وەک ئەمڕۆ هەیە!) بەڵکو جاران ڕۆڵی قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و زانکۆیشی بینیوە، لەوەش زیاتر وەک مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری و سەنتەرێکی تیشکهاوێژی زانستەکانی ئەوسەردەم ڕۆڵی بینیوە.

کەواتە پرسیارەکەمان بەشێوەیەکی تازە دادەڕێژینەوە و دەپرسین: ئەو ئیسلامییە ڕاست و ڕاستەقینانە، بۆچی نایەن ئیعتیبار و بەها و ناوەڕۆک و ڕۆڵی گەورەی جاران مزگەوت هەیبوو، بۆی بگەڕێننەوە؟! بۆچی نایەن ئەو ڕۆڵە جوان و بەرزەی جاران مزگەوت هەیبوو، دروستی بکەنەوە؟
ئایا شەرم نامان گرێ ئەگەر بڵێین ئەو مزگەوتەی کە جاران شاعیری گەورەی وەک مەلای جەزیری و مەحویی دروست دەکرد، ئەمڕۆ بۆتە جێگەی تەنیا نوێژ و دوعا و خوتبەدانی ژێر کاریگەرێتیی فلان حیزب؟! بۆتە جێگەی تەنیا پێویستییەکانی ڕێبواران و وەخت بەسەربردنی پیرەمێرد و بێکارەکان!؟
مزگەوت بەڕاستی نەیتوانیوە و ناتوانێ بەتەنگ کێشە و داخوازییەکانی نەسلی نوێوە بچێت و پێدەچێ تا هەتایەش هەر ئاوا لە پەراوێزدا بمێنێتەوە. گەلێک شاعیرانی وەک حەمدی، دیارە لە دەمێکەوە هەستیان بەم جیاوازییە کردووە:

ئەو شەخصە کە ئەیکرد بە دوعا مەنعی موصیبەت
ئێستاکە بەلایە کە دەکا دەستی بە وەر وەر
ئەو پیرە کە ئوفتادەیی مەسجید بوو لەبەر فەیض
هەڵساوە وەک فیتنە قەدی میسلی سنەوبەر

کەواتە، بە هەموو شێوەیەک دەردەکەوێ کە تیرۆری ئیسلامی، دوور لە ئیمان و هەر ئامانجێکی جوان، مەبەستیان تەنیا و تەنیا پساندنی شیرازەی گەشەسەندنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کوردستانە، دەیانەوێ گەنج و خوێندکارانی کوردستان نەتوانن بگەنە قۆناغەکانی ڕەهایی و ئازادی و ڕاپەڕینە خوێندکارییەکان.

لە هەمووی سەمەرەتر ئەوەیە کە مەنهەج و دەرس و موفرەداتی دەرسەکان و بناغەکانی پەروەردە و قوتابخانە و زانکۆ و ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنمان، ئەگەر وەزارەتەکانی ڕۆشنبیری و پەروەردە لێی بەرپرسیار بن یانیش حیزب و دەزگاکانی دیکە، زۆربەی هەرە زۆریان بەشێوەیەکی وا دارێژراون کە گەرا دابنێنەوە بۆ لەدایکبوونی ئیسلامی سیاسی، لە هەمان کاتیشدا بنەماکانی «تیرۆریزمی ئیسلامی» دەڕوێنن و بە ڕەوا و جوان پیشانیان دەدەن! تەنانەت لە هەڵسوکەوتی دەسەڵاتداران و ڕاگەیاندن و حکوومەتیشدا هەمان ڕەفتار دەبیندرێت. بۆ نموونە: خەڵکی ڕۆشنبیری ئاکرێ دەڵێن: هەموو خەڵکی ئاکرێ حەزدەکەن سینەمایەک یان هۆڵێکی شانۆ یان یانەیەکی لاوان لە ئاکرێ بکرێتەوە، هەموو خەڵکی ئاکرێ حەزدەکەن یانەیەکی مەشرووبخواردنەوە یان هوتێلێک لە ئاکرێ دابمەزرێت، هەموو خەڵکی ئاکرێ حەزدەکەن سەنتەرێکی گەنجان یان مەلەوانگەیەک لە ئاکرێ دابمەزرێت؛ بەڵام حکوومەتی هەرێم هەموو ئەو شتانە ناکاتەوە.. بۆچی؟ دەڵێن چونکە چەند شێخ و مشایەخ و ئاغایەکی ئیمانداری شارەکە پێیان ناخۆش و کفرە! بەلایانەوە کفرە کە ئەم شتانە لەناو میللەتی ئێمەدا هەبێت.

هەر سەبارەت بەم مەسەلەیەی دووفاقیی (ئیزدیواجیەتی) سەرکردایەتیی کورد، چەند ساڵێک پێش ئێستا کۆمەڵێک گەنج و قوتابیی ڕووناکبیری سەرازای هەولێر گۆڤارێکیان بڵاودەکردەوە بە ناوی (نوێ)، پاش بڵاوبوونەوەی یەکەمین ژمارەی ئەو گۆڤارە، دەمودەست چەند مەلا و شێخ و خەتیبێک، چووبوونە لای سەرکردایەتیی کورد و داوایان لێ کردبوو کە ئەو

گۆڤاره دابخرێت و دەستەی نووسەرانەکەیشی تەئدیب بکرێن! ئەمە هەمووی سەبارەت بەوەی کە گۆڤارەکە چەند وتارێکی لەبارەی سێکس و ڕۆشنبیریی سێکسی بڵاوکردبووەوە. ئیتر بەم شێوەیە، ئەم گۆڤارە گەنجانەیە چیی تر یەک ژمارەی دیکەی لێ دەرنەچوو.
ئەم هەڵوێستەی لاگرتنی مەلاکان و چاوسوورکردنەوە لە گەنجەکان و ڕێگەگرتن لە ئاوات و سەرگەرمییەکانیان، بێگومان، گەنج و قوتابی لە سەرکردایەتیی کورد دەتۆرێنێ و وایان لێدەکات ڕەقیب و دوژمنانی کورد بە ڕاست و سەرکردایەتیی کورد بە ترسنۆک و هەڵە بخوێننەوە!

هەر لەبارەی ئەم دووفاقییەی سەرکردایەتیی کوردەوە، ئێمە دەزانین مزگەوت لە کوردستاندا ڕۆڵێکی ئەوتۆ لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و پێشکەوتنی خەڵکدا نابینێ. مەسەلەن، مزگەوت لە سەردەمەکانی کۆندا ڕۆڵی قوتابخانە و خەستەخانە و مەحکەمە و کتێبخانە و زانستگە و زۆر شتی دیکەیشی دەبینی، بەڵام ئەمڕۆ مزگەوت چۆتە پەراوێزەوە. حکوومەتی کوردستان، کەواتە، چۆن هێشتا هەر پابەندی دروستکردنی ئەو هەموو مزگەوتەیە و کەچی لە یەک کتێبخانە زیاتریش (بۆ نزیکەی ملیۆنێک دانیشتووان) لە پایتەختەکەیدا نیە ! زیاتر لە ٣٧٦ مزگەوت لەم شارە هەیە؛ کەچی تەنیا یەک کتێبخانەی گشتیی لێیە، بێ هیچ سینەمایەکی هاوچەرخ و بێ هیچ مەدینەتولعابێک و بێ هیچ سەنتەرێکی دڵخۆشیی گەنجان و قوتابیان! ئەمە لەکاتێکدا پێویست وابوو، چۆن لە هەر گەڕەکێکدا پێنج مزگەوت هەیە، دەبووایە بە هەمان شێوە لە هەر گەڕەکێکدا سێ کتێبخانە، لە هەر گەڕەکێکدا سێ سەنتەری ڕۆشنبیریی گەنجان و قوتابیان، لە هەر گەڕەکێکدا سێ سینەما، لە هەر گەڕەکێکدا سێ هۆڵی شانۆ و مۆسیقا، لە هەر گەڕەکێکدا سێ مەڵبەندی دڵخۆشیی لاوان و خوێندکاران، لە هەر گەڕەکێکدا سێ باخچەی خێزانی، لە هەر گەڕەکێکدا سێ مەڵبەندی فێربوونی زمان.. هەبێت!
بەڵام بەداخەوە: نە لە هەولێری پایتەختدا و نە لە هیچ شارێکی دیکەشدا، لە هەر گەڕەکێکدا تەنانەت نیو کتێبخانەیش و نیو سەنتەری

ڕۆشنبیریش و نیو سینەمایش و نیو هۆڵی شانۆ و مۆسیقایش و نیو مەڵبەندی دڵخۆشی وباخچەی خێزانیش و نیو مەڵبەندی فێرکردنی زمانیش بەدی ناکرێت!

حەیف: ئەم وڵاتەی ئێمە، کە ئەو هەمموو چەپڵەیەی تێدا بۆ سەرکردەکانمان لێ دەدەین، سەحرای هونەر و زانست و ڕۆشنبیری و دڵخۆشسییە بۆ گەنج و خوێندکارانی کورد!

حەیف: ئەم وڵاتەی ئێمە، کە نەک سەرۆکێکی کورد بەڵکو سێ سەرۆکیشی هەر کوردن و ئەو هەموو بەقوربان و بەساقەیەشیان دەبین، کەچی ڕۆڵەکانی، گەنجەکانی، خوێندکارەکانی، هەر هەموویان، لەناو حرمانی هونەر و جوانی و کتێب و زانست و ڕۆشنبیری و دڵخۆشی و تەفریحدا دەخنکێن! چ گوناحن، چەند جێگەی بەزەیین: قوتابی و گەنج و نەوجەوانانی کورد!

ئەم ئیهمال کردنەی ژیانی لاوان و قوتابیان، هەروەها ئەم دووفاقی و ڕاڕاییەی سەرکردایەتیی کورد لەهەمبەر مەسەلەی پێشکەوتنی ژیانی خوێندکار و گەنجان، ئەم توێژە فراوانە جوانە لە خۆی دەتەکێنێتەوە، ڕایاندەپێچێ بەرەو کونجە تاریکەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، بەرەو سەنگەری تیرۆریستان و هاوکاریکردنیان، ڕایاندەپێچێ بەرەو بێزاری و دڵتەنگی و خۆتەقاندنەوە. وەفایی دەڵێ:

که ئیسلامی بەهار فتوای جیهادی کافری دەی دا
سنەوبەر نێزە، گوڵشەن گورز، سۆسەن خەنجەری هێنا

# مامۆستا:
# دوژمنی خوێندکار

گەلێک بیروڕای نادروستم لە سەردەمی منداڵییەوە وەک بیروڕای ڕاست وەرگرتووە؛ ئیتر لەوە گەیشتم کە ئەگەر بمەوێ بگەمە بەرەنجامی زانستی و ڕەسەن، پێویستە ڕاستەوخۆ و تا هەتایە دەسبەرداری هەموو ئەو بۆچوونانە بم کە جاران هەمبوون؛ کارەکانیشم تەواو لەسەر بنچینە تازەکانەوە دەست پێ بکەم.

دیکارت

ڕامانەکان. ڕامانی ١



- باشه (سەرەڕای کەمیی ژمارەی مامۆستایانی زانکۆ) خۆ بێتوو ئەگەر مان بگرن، دەتوانن ببنە هێز و قورساییەک، وەرەقەیەک!

- پێشنیار و پێشبینییەکە، زۆر جوانە، بەڵام مان ناگرن.

- بۆچی.

- مان ناگرن.

- ئەدی ئەو هەموو مامۆستایانەی دیکەی قوتابخانەکانی ناوەندی و ئامادەیی؟!

- مان ناگرن. چ بکەم.

- باشە، خۆ مامۆستایانی زانکۆ، بەرزترین پلەی ئەکادیمی و ڕۆشنبیری و ئەپستمۆلۆژیای گەلن؟!

- لە دیدارێکی ڕۆژنامەی (ڕووانین)ی یەکیەتیی قوتابییاندا، پرۆفیسۆر سەعدی بەرزنجی کە سەرۆکی پێشووی زانکۆی سەلاحەدین بوو، بەئاشکرا بەراوردی زانکۆ بە جەیش و بەراوردی مامۆستای زانکۆش بە ئامر بەتالیۆنێکی جەیش دەکات و شانازی بەو بڕوانامەیەشەوە دەکات و دەڵێ: (چۆن لە جەیش ڕێز لە ڕوتبەی عەسکەری دەگرن، لە زانکۆشدا پلەی زانستی و بڕوانامە پێوەرە).

- ئەدی مادام، چۆن، بۆچی هیچ ڕۆڵێکیان نەبووە و نیە (هیچ نەبێ) لە ریفۆرمێکدا؟

- تۆ تەماشای واقیعەکە بکە و بیر بکەوە: لە هەر زانکۆیەکی کوردستاندا چوار صەد تا شەش صەد مامۆستا هەن. وایە؟

- وایە.

- ئایا بە هەموویان، لە هەر زانکۆیەکدا چەند ڕۆژنامەیان هەیە؟ چەند ڕۆژنامە بڵاودەکەنەوە؟

- هیچ.

- تەنیا گۆڤارێکی «گوایە ئەکادیمی» نەبێ لە هەر زانکۆیەکدا، کە ئەویش لەپێناو تەرقیەکردن و پلە و پایە وەدەستهێنانی شەخسیی خۆیان،

ساڵی جارێک بە هەزار شەڕەشەق دەردەچێ.

- وایە.

- ئەمە لەکاتێکدا گەنج و خوێندکاران دەیان ڕۆژنامە و هەفتەنامە و مانگنامە و دەیان گۆڤاریان هەیە، کە ئەمانەی خوارەوە تەنیا هەندێکیانن کە لەلایەن چەندین گرووپ کۆمەڵە و دەستە و تاقم و یەکیەتی و ڕێکخراوی گەنجانە و خوێندکاریی جۆراوجۆرەوە (تەنیا لە شاری هەولێر و سلێمانی) بڵاودەکرێنەوە: مەکۆ، ڕووانین، ئاڤێستا، شوناس، خوێندنی لیبراڵ، گۆڕان، ئەمڕۆ، زەنگی زانکۆ، هاوڵاتی، لاوان، دیدی نوێ، لڤین، گۆنا، شەقام، دەربەندیخان، جەماوەر، هاموون، ڕا، نۆژەن، داهێنان، هەنگاوی نوێ، ڕابوون، کرانەوە، پرژە، ئاراستە، سۆلیداریتێ، پەیمانی نوێ، ژیانی نوێ، بایت، گەنجان، ڕۆشن، خامە... کەواتە با بپرسم: ئەم جیاوازییە چی دەگەیەنێ؟!

- ئەوە دەگەیەنێ کە مامۆستاکانی زانکۆ نوستوون، بەڵام تەڵەبە و گەنج بیردەکەنەوە.

- مانای ئەوەیشە کە مامۆستا حەزناکات و نایەوێت (لە بەرژەوەندیی ئەودا نیە هیچ پێشکەوتنێک و ریفۆرمێک لەم بەستێنە زانکۆیی و پەروەردەییەدا ڕووبدات). پرسیارێکی دیکە: بە هەر سێ زانکۆکەی کوردستان و بەم هەموو سەدان مامۆستای زانکۆیەوە، چەند سەنتەری ڕۆشنبیرییان هەیە؟

- تەنانەت ڕابیطەیەکی مامۆستایانی زانکۆیش نیە.

- تەنێ، لە هەر زانکۆیەکدا «مەرکەز سەقافییەک» هەیە کە سەر بە زانکۆیە.. ئەویش لە هەر سێ شارەکەدا بوونەتە جێگەی عارەقخواردنەوەی هەندێک لە خۆیان و فیتەر و قەصاب و پاسکیلچییەکان.. بەڵام قوتابی بەهیچ شێوەیەک بۆی نیە بچێتە ژوورەوە!

- ئەدی مامۆستایانی پەروەردە؟

- مەبەستت ئایا بۆیان هەیە بچنە ژوورەوە یان نا؟

- نا، مەبەستم: ئاخۆ مامۆستایانی پەروەردە چ چالاکییەکیان هەیە؟

- مامۆستایانی پەروەردەش تەنیا گۆڤارێک و مەڵبەندێکی ڕۆشنبیرییان

هەیە، کە ئەویش بە هەمان شێوە بۆتە جێگەی عارەقخواردنەوەی هەندێک لە خۆیان و پۆلیس و سایەق تەکسی و ئەو موهەندیسانەی مالیان لە «مەڵبەندە ڕۆشنبیرییەکەی خۆیان»ەوە دوورە.

- کەواتە، تاکە جیاوازییەکی مەڵبەندە ڕۆشنبیرییەکەی زانکۆ لەگەڵ مەڵبەندە ڕۆشنبیرییەکەی مامۆستایان..

- لەوەدایە کە یەکەمیان قوتابی بۆی نیە بەهیچ شێوەیەک بچێتە ژوورەوە، بەڵام ئەوەی دووەم: قوتابی -ئەگەر جلوبەرگێکی قەصابان لەبەر بکات- ڕێگەی دەدەن بچێتە ژوورەوە!

- بەڵێ. ئەمە هەموو چالاکییەکانی مامۆستا و مامۆستایانی زانکۆی! کەچی لەناو پۆلە سارد و سڕەکانیشیاندا گازاندە لە قوتابیان دەکەن کە کتێب ناخوێننەوە و لەم ڕووەوە گاڵتەیان بێدەکەن و بە چاوی سووکەوە دەڵێن (گەنجی ئەم زەمانە بەڕەڵان و ناخوێننەوە).

- گوتمان: مامۆستایان لەوە زیاتر هیچی دیکەیان نیە، هیچ سایتێکی ئەنتەرنێتیشیان نیە!

- دە بیر لە هەموو ئەم جیاوازییانە بکەرەوە، ئەمە لەکاتێکدا قوتابیان و لاوان، ئەمڕۆ، بەپێچەوانەی مامۆستا پیر و نوستووەکانیان دەیان سایتی ئەنتەرنێت و دەیان سەنتەری گەنجان و مەڵبەندی ڕۆشنبیری و کۆمەڵەی قوتابیان و ڕێکخراوی خوێندکاران و بنکەی ڕووناکبیری و پیشەیی و زانستیی جۆراوجۆریان دروستکردووە.. لەگەڵ چەندین ئەڵقەی ڕووناکبیرانە و گەنجانەی وەک (بازنەی گفتوگۆ) و (گرووپی هەڵوێست) و (گرووپی خۆشەویستی)، (سەنتەری هامون)، (بزووتنەوەی پێشکەوتنی گەنجانی کوردستان).. کە هەموویان ڕۆڵی پلەی یەکەمیان هەیە لە یاخیبوون و خۆپیشاندان و تەکاندانەکانی بەستێنی بەرەوپێشەوەبردنی مەعریفە و بڵاوکردنەوەی لە کوردستاندا. دیسان دەپرسم: ئایا ئەم جیاوازییە چی دەگەیەنێ؟

- ئەوە دەگەیەنێ کە مامۆستایان، پیر، تاقەتیان لە کار چووە، بەڵام قوتابی و گەنج هەمیشە و بەردەوام بێدار، دڕ بە ژیان و بەربەستەکاندا دەدەن.

- هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە مامۆستا، بەو دەزگایەشەوە کە ئینتیمای بۆی هەیە، حەزناکەن و نایانەوێ (لە بەرژەوەندیی ئەواندا نیە هیچ پێشکەوتن و ریفۆرمێک لەم بەستێنە زانکۆیی و پەروەردەییەدا ڕووبدات). پرسیارێکی دیکە: ئایا لەناو هیچ یەکێک لە زانکۆکانی کوردستاندا بەڕێوەبەرایەتییەک هەیە بەناوی (بەڕێوەبەرایەتیی کولتووریی زانکۆ)؟ هیچ بەشێکی ئیداری لەپێناو دەستۆیی کردنی چالاکییە هونەرییەکانی قوتابیان و لەپێناو پەروەردەکردنی بەهرەی کولتووریی خوێندکاراندا هەیە؟ هیچ تیپێکی شانۆیی زانکۆ یان پەروەردە؟ هیچ گرووپێکی مۆسیقایی زانکۆ یان پەروەردە؟ هیچ ...؟!

- بە بیرم دێ، لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا، دوو هونەرمەندی گەورەی میسر، عادل ئیمام و صلاح السعدنی، جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە بەهرەی هونەریی ئەوان لەوکاتەوە دەستی پێ کردووە کاتێ چوونەتە زانکۆ و لەوێ لەناو تیپە شانۆیی و هونەرییەکانی زانکۆدا توانیویانە ببنە ئەو دوو هونەرمەندە گەورەیەی هەموو میسر و هەموو عارەبی دنیا شانازییان پێوە دەکات!

- کەواتە، دەیان ساڵە، ئاخۆ، چەند بەهرەی جوانی خوێندکاران و چەند گوڵی تازەپشکوتووی هونەریی قوتابیانمان، کە دەبووایە دەستیان بگیرێت و یارمەتی بدرێن، بوونەتە قوربانیی ئەم گەلحۆیی و کەودەنی و تەوەزەللییەی سەرۆکایەتییەکانی زانکۆکانمان و بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکانی پەروەردەمان؟! ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم دەزگا گەورە (بەناو پەروەردەیی و ئەپستمۆلۆژییە) بۆئەوە کاردەکات کە بەهرە و گەنجێتی و نەوجەوانێتیی قوتابیانمان بکوژێت؟

- بەڵێ،ساڵی (٢٠٠٣) هەر سێ سەرۆکایەتییەکەی زانکۆکانی سەلاحەدین و سلێمانی و دهۆک ڕێککەوتننامەیەکیان ئیمزا کردووە لەپێناو لەباربردنی هەرچی خۆپیشاندان و هەرایەکی خوێندکارانە..

- لەسەر قسەکەی پێشووی تۆ، لە سەرۆکایەتیی زانکۆکاندا بەشی ڕاگەیاندن هەیە!

- بەڵێ، بریتیە لە بەشێکی گرێدراو بە نووسینگەی سەرۆکی زانکۆ، چەند کامێرا و لافیتە و دەفتەر و قەڵەمێکی لێیە: تەنیا لە کاتی چاوپێکەوتنەکانی خۆیدا و لە کاتی «حەفلەی تەخەروج» و پڕۆپاگاندە حیزبی و ئیدارییەکاندا ساڵی چەند ڕۆژێک دەکەونە کار.
- لە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەشدا بەشێک هەیە بە ناوی (بەڕێوەبەرایەتیی چالاکییە قوتابخانەییەکان).
- ئەمەیان لەوەی زانکۆ هەندێک باشترە، چونکە ئەوان هیچ نەبێ ساڵی جارێک ئیشی دەستی قوتابییەکان و کڵاو و گۆریە و بێشکە و کەلوپەلی عەنتیکەی دیکەی ماڵەوەی قوتابییەکان کۆدەکەنەوە و لەوێدا پیشانی یەکتریان دەدەن!
- پێدەچێ بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە حاڵی کەمێک لەم ڕووەوە باشتر بێت لەچاو زانکۆکان؟
- ئەگەر وابووایە قوتابی کاتێ شەشەمی ئامادەیی تەواو دەکرد و دەگەیشتە زانکۆ بەشێوەیەکی لێزان و ئامادە دەگەیشتە زانکۆ؛ بەڵام وا نیە؛ چونکە قوتابی هەر لە قۆناغەکانی پەروەردەوەوە بەشێوەیەکی کەموکورت و ئیفلیج پەروەردە دەکرێت: بێ خەبەر لە هەموو مەعریفە و زانست و هونەر و مێژوویەکی کولتووری و نەتەوەیی و هاوچەرخی جیهانی.
- بەرپرسەکانی پەروەردە گازاندەی ئەوەیان هەیە دەڵێن (زانکۆ - خۆی) کادری باش و مامۆستای لێهاتوومان بۆ دروست ناکات و ئەمەش وادەکات مامۆستاکانی ئێمە مامۆستای باش و شایستە نەبن؛ واتە خراپیی ئاستی مامۆستا دەگەڕێنێتەوە بۆ گەندەڵیی سیستەمی زانکۆ و مەنهەجی خوێندنی زانکۆیی و پەیمانگەکانی مامۆستایان.
- ئەمە ڕاستە، بەڵام لە هەمان کاتدا (پەروەردە) و سیستەمی پەروەردەیی و مەنهەجەکانی ئەوانیش - خۆشیان لە مەرگەساتەکەدا بەرپرسیارن.
- چۆن؟
- ئەگەر بێتوو پەروەردە باش قوتابیان ئامادە بکات و بیانخاتە

ئاستێکی بەرز و ڕسکاوی شایستە، ئەوا ئەو قوتابیە لێهاتووانە کاتێ دەگەنە زانکۆ لە ئامادەباشیی ئەوەدا دەبن کە بتوانن بەهرە و تواناکانیان بەتەقێننەوە و کادری داهێن و پێشکەوتوویان لێ دروست ببێت. بۆیە لەم ڕووەوە، بەرپرساوی یەکەم و تاوانباری یەکەم بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەیە.

- چۆن؟

- تۆ هەر سەیری ئەوە بکە: تا ئێستا چەندین جار جوگرافیای سیاسیی دنیا گۆڕاوە، کەچی لە کتێبە قوتابخانەییەکانماندا جوگرافیای سیاسیی گۆی زەمین هەمان جوگرافیای سیاسیی سەردەمی «عفیفە اسکندر» و یووسف و عومەرە! تا ئێستا چەندین گۆڕان بەسەر دیدمان بۆ زمان و مێژووی ئەدەبی کوردی و وێستگەکانی کولتوور و مێژووی نەتەوەییمان داهاتووە، کەچی لە کتێبە قوتابخانەییەکانماندا، دید و تێگەیشتنمان هەمان دید و تێگەیشتنی سەردەمی ئەحمەد حەسەن بەکرە! یان بۆ نموونە نەوەیەکی تازەی دووای ڕاپەڕین، ئازادیخواز و کوردستانی، پەیدا بوونە کە دەیانەوێ کولتووری کورد و مێژووی کورد و جوگرافیای کوردستانی گەورەی خۆیان بناسن، کەچی تا ئێستا لە قوتابخانەکانماندا زیاتر جوگرافیا و کولتوور و مێژووی (قەعقاع) و باپیرەگەورەکانی حافظ الاسد فێری نەوجەوانانی ئەمڕۆی کورد دەکەن!

- پێش ئازادکردنی عیراق و پێش ڕووخانی صەددام، وەزیری پەروەردە و مەنسوولەکانی خۆمان دەیانگوت: (یۆنسکۆ) ناهێڵێ ئەو مەنهەجانەی کتێبە قوتابخانەییەکان بگۆڕین.

- وا نیە، مامۆستاکانی خۆمان و پەروەردەی خۆمان تەمبەڵ و پیرن و تاقەتی کارکردنیان نەماوە و نیە.

- چۆن؟

- ئایا هەر یۆنسکۆ بوو نەیدەهێشت و ناهێڵێ وانەکانی (وەرزش) و بەتایبەتی (وانەی ڕەسم) و (وانەی هونەرەکان) پایە و ئیعتیباری خۆیان بۆ بگەڕێتەوە؟

- مەبەستت چیە؟

- یۆنسکۆ ڕێگە لەوە دەگرێت بیربکەینەوە ناوەڕۆکێک، مەعریفەیەک،

سوودێک، چێژێک ببەخشینە وانەی ڕەسم و هونەرەکان؟! ئایا تۆ دەزانی، تا ئێستاش وانەی ڕەسم و هونەرەکان لە قوتابخانەکانماندا قەشمەرجاری کردنە بە زانست و هونەر؟ مامۆستا دێتە ژوورەوە و دەڵێ (ڕەسمێک بە ئارەزووی خۆتان بکێشن) و ئیتر لێی پاڵ دەداوە. هەر دەڵێی ئەم دەرسانەیان لەپێناو ئەوە داناوە کە قوتابی بێز لە ڕەسم و وەرزش و هونەر بکاتەوە و پێی شتێکی سووک و عەیب و ناچیزە بێت؟! دەیان قوتابیی کۆلێژی وەرزشی لەسەر لەپەڕە ڕۆژنامە خوێندکارییەکاندا نووسیویانە و دەڵێن: (کە دەڵێین لە کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی دەخوێنین خەڵک گاڵتەمان پێ دەکەن). تەنانەت وانەکانی دیکەش، زۆر بێ سەروبەر، لە زۆربەی قوتابخانەکاندا بەپێی میزاجی ئەو مودیر و پیر و مورشیدانە بەڕێوە دەچێ کە حەزدەکەن ئێستاش دار و حەیزەران و لینگە قۆندرە لەگەڵ خۆیان - بۆ دارکاریکردنی تەڵەبە - بهێننە ژوورەوە. بۆ نموونە وانەی ئینگلیزی، زۆر ئاساییە ئەگەر بدرێتە مامۆستایەک کە ئیختیساسی عەرەبی بووە و بە حەسەن دەڵێ (عەسەن) و بە (عیلم) دەڵێ (حیلم) و نۆساڵیش بووە خۆی تەقاویت کردووە بەڵام لەبەر تەماحی زیادبوونی مووچە و هەواڵی عەرد تەوزیع کردن بەسەر مامۆستایاندا هاتۆتەوە ڕیز و دەچێ «ئینگلیزی» فێری منداڵەکانمان دەکا! با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

- چیی دیکە!

-گەنج و قوتابی و خوێندکارانی زانکۆ، بەپێچەوانەی هەڵوێستی مامۆستا و مامۆستایانی زانکۆ، دەبینین هەمیشە، دەسپێشخەر، لە زۆربەی کێشە نیشتیمانی و قەیرانە گورچووبڕەکاندا پێش مامۆستاکانی خۆیان کەوتوون: بۆ نموونە لە کاتی ئەگەری لەشکرکێشییەکەی تورکیا بۆ ناو خاکی کوردستانی عیراق، یان لە کاتی کوشتارە خوێناوییەکەی حکوومەتی فاشیستی سووریا بەرامبەر خەڵکی کوردی قامشلووی کوردستانی سووریا، هەروەها لە کاتی بەعسی دەرچوون و جاسووس دەرچوونی هەندێ لە مامۆستایانی زانکۆ و ئەندامە بەرزەکانی ناو حیزبە دەسەڵاتدارەکان، دەبینین ئەم توێژە هوشیار و خاوەن ویژدان، پێش هەموو

توێژێکی دیکەی کۆمەڵ، تەنانەت پێش مامۆستاکانی خۆشیان لە زانکۆ دەسپێشخەر بوونە: هەر زوو هەڵوێستیان نواندووە؛ چ بە مانگرتن یان بە خۆپیشاندان یان بە چالاکیی دیکە.. دووای ئەوان ئنجا توێژە ناوبراوەکانی دیکە -ئەمەش دووای وەرگرتنی ئیعاز لە حیزب- ڕێپێوانێکیان تا بەردەمی پەرلەمان کردووە! ئایا ئەم جیاوازییە فراوان و گەورەیەی نێوان مامۆستا و قوتابی، چۆن لێک دەدرێتەوە؟

- وا لێک دەدرێتەوە کە مامۆستایان و مامۆستایانی زانکۆ، بەشێکیان تا بینەقاقا سەر بە کولتووری بەعس، بەشێکیان پیر و پەککەوتە، بەشێکیشیان تاقەتیان لە خەبات چووە یانیش باوەڕیان «بەم شتە هەرزەگۆیی و هەرزەکارانە» نەماوە؛ بەڵام قوتابی و گەنج هەمیشە بێدار، ئومێد دەچێنن و بەردەوام خەبات دەکەن! دەزانی، ئەم جیاوازییەی نێوان پیر و گەنج دێڕە شیعرێکی نالی -م بیردەخاتەوە، کە تێیدا بە (گەنج) دەڵێ:

تۆ یووسفی نەوحوسنی لە میصری جیهانی
من پیرم و فانی
لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندووم و نە مردووم

- منیش ئەوەم بیر دەخاتەوە کە بڵێم: مامۆستا سەرقاڵی تەنیا یەک شتە: شەڕکردنی بەردەوام لەپێناو وەرگرتنی زۆرترین موحازەڕات و سەرپەرشتیکردنی زۆرترین «ماستەرنامە» و زۆرترین پارەی ئوجووری موحازەڕات و گفتوگۆکردن لەسەر زۆرترین «دکتۆرانامە». مامۆستا بەرژەوەندییەکانی خۆی لەکوێ بێت، لەوێ دەبێت.. بەرژەوەندیەکانی لەگەڵ کێ بێت، لەگەڵ ئەو دەبێت.

- کەواتە، شتێکی زۆر سروشتی و ئاساییە کە مامۆستا بکەوێتە سەنگەری دەسەڵاتەوە و بەرگری لە دەسەڵاتە مەعریفی و پۆلیسی و ئیدارییە هەرەمییەکە بکات.

- سەنگەر؟

- بەڵێ، سەنگەر؛ چونکە من وای دەبینم کە ئەمڕۆ لەم بەستێنەدا، لەم

ململانێیەدا، دوو سەنگەری دژ بەیەکتر - پڕ بە مانای وشە: دژ بەیەکتر - هەن، کە دوژمنی سەرسەختی یەکترن: سەنگەری مامۆستایان کە بەرگریکاری دەسەڵاتە مەعریفی و ئیدارییە پیر و بیرۆکراتەکەن، سەنگەری دووەمیش: قوتابیان و گەنجەکانن کە گۆڕانخواز و یاخیگەر دەیانەوێ ریفۆرمێک لە ژیان و سیستەمەکەدا دروست بکەن!

- بە چ نموونەیەک دەتوانی ئەم قسەیەت بسەلمێنیت؟

- گۆڤاری ڕامان: ژمارە ١٥ کە لە ٥ی ئەیلوولی ١٩٩٧ بڵاوکراوەتەوە، دوو پرسیاریان بۆم ناردبوو: (ئایا خوێندکاری زانکۆ هیچ لە مامۆستا فێر دەبێت؟ هەروەها ئایا بڕوانامەکانی دکتۆرا قابلین بۆ ڕەخنەگرتن لێیان یان نەخێر؟) منیش بێگومان ڕەخنەگرانە گوتبووم کە بەداخەوە شەهادە و دکتۆرا شەرعیەت دەدەنە ڕاستبوونی مامۆستا بەرامبەر خوێندکاری بەستەزمان، هەروەها گوتبووم کە زۆر کتێبی نائەکادیمی هەن لە زۆربەی شەهادەکانی دکتۆرا بەپێزترن.. لەوەش زیاتر شتێکی وام نووسیبوو کە لەمەودووا پێویستە گوێ لە خوێندکارەکمان بگرین! لەسەر ئەم قسانە سەرۆکایەتیی بەشی کوردی و لیژنەی زانستیی بەشی کوردی لە کۆلێژی ئاداب، بە سەرۆکایەتیی پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار، لەسەرەتادا ویستیان فەسلم بکەن، بەڵام پاشان لیژنەی زانستیی بەش مەزبەتەیەکیان لەسەرم نووسی و لەوێدا کارێکیان پێکردبووم کە با بە دەواری شەڕی نەکردبێ، ناردبوویان بۆ گۆڤاری (ڕامان)، گۆڤارەکەش پێی گوتبوون: (زۆر قسەی ناشیرین و جنێوی تێدایە، هەندێکی لێ لابدەن.. ئنجا بڵاوی دەکەینەوە!).

ئەمەی گێڕامەوە نموونەیەکی زۆر بەپەلە و ساکاری ئەم سەنگەربەستنەی مامۆستایانی زانکۆیە دژی قوتابی؟ نموونەیەکی دیکەش: ئەو ڕێککەوتننامە سێ قۆڵییەیە لە ساڵی (٢٠٠٣) لەنێوان سەرۆکایەتیی هەر سێ زانکۆکانی دهۆک و سلێمانی و سەلاحەدین لەپێناو لەباربردنی هەموو جۆرە خۆپیشاندانێکی خوێندکارانە. ئەمە سەنگەر... جیاوازییەکی دیکە!

- چی؟

- قوتابیان و گەنج، بەردەوام، لە سەنتەر و بنکە ڕۆشنبیرییە جۆراوجۆرەکانیاندا گۆڤار و ڕۆژنامە دەردەکەن و کۆڕ و سیمینار دەگێڕن و خولی فێرکردن سازدەدەن و کتێبخانەیان هەیە.. لە کۆڕ و کۆبوونەوە و سیمینارەکانیشیاندا بەردەوام باسی یاخیبوون دەکەن و ڕەخنە لە مەعریفە و کۆمەڵ و سیاسەت و ئەخلاق و دین و دەسەلآت دەگرن..

- دە، من ڕاشکاوانە قسە دەکەم: کەچی لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی مامۆستایاندا، بەردەوام - بەتایبەتیش کاتێ دەسەلآتدارێکی گەورەی حیزب ئامادە دەبێت - باسی هەرە گرنگ و باسی هەرە لەپێشەوەتری ئەو مامۆستایانە مەسەلەی مووچە و وەرگرتنی پارچەزەوی و ئەم بەرژەوەندییە تایبەتییانەی خۆیانە!

- ئەمە بەڵگەیەکی دیکەی ئەوەیە کە مامۆستا (لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی زیاتر) نایەوێت و بەلایەوە گرنگ نیە ریفۆرم ساز بکرێت.. بەتایبەتیش چونکە ئەو ریفۆرمە لە بەرژەوەندیی ئەودا نیە.

- تەنانەت لە کۆنفرانسە هەرە گەورەکەی ئەم دواییەی مامۆستایانی زانکۆدا کە هەر سێ زانکۆ بەشدارییان تێدا کردبوو و بڕوانامەی ماجستێر بۆی نەبوو بەشداری تێدا بکات و چەندین ملیۆن دۆلاری بۆ خەرج کرا: بە هەموویان نەیانتوانی سانتیمەترێکیش گۆڕان و ملیمەترێکیش ریفۆرم دروست بکەن لەئاستی زانکۆدا.

- نەک قوتابی، یان نوێنەرێکی خوێندکاران، تەنانەت مامۆستای هەڵگری بڕوانامەی ماجستێریش بۆی نەبوو بەشداری لە کۆبوونەوەکانی ئەم کۆنفڕانسەدا بکات (چونکە گەنج بوون).

- کەواتە، مامۆستایان چارەنووسی خۆیان و قوتابیان و زانست و مەعریفە و میللەتیان سپاردۆتە دەست حیزبەکان، بوونەتە پاشکۆی ئەوان و پاڵیان لێ داوتەوە.. کڕ کڕ دەخۆن و دەنوون؟ هەر بۆیەش لە سەنگەری دژ بە تەڵبە و گەنج دان!

- مەسەلەکە هەرەمییە.

- چۆن؟

- مـامـۆسـتـاكـان ملكەچی سـەرۆك بەشی خـۆیانن، یان ملكەچی بەڕێوەبەر. سـەرۆكی بەش یان بەڕێوەبەرەكـان كـۆبوونەوەیان پێ دەكـەن و بڕیارەكانیان بۆ دەخوێننەوە بۆئەوەی جێبەجێیان بكەن.

- بەڕێوەبەر و سەرۆك بەشەكانیش؟

- بەڕێوەبەر و سەرۆك بەشەكانیش ملكەچی بەڕێوەبەرە گشتییەكان یان عەمیدەكانن كە كۆبوونەوەیان پێ دەكەن بۆئەوەی بڕیارەكانیان جێبەجێ بكرێت.

- عـەمیـد وبەڕێوەبەرە گـشـتـیـیـەكانیش ملكەچی سـەرۆك زانكۆكـان و وەزیرەكانی پەروەردەن.

- كەواتە، ئەمە هیچ سوودێكی نیە ئەگەر بۆ نموونە سەرۆك بەشێك یان بەڕێوەبەرێك لابـەن و سـەرۆك بەشێك یان بەڕێوەبەرێكی دیكە لەجێی دابنێین؟

- نەخێـر، چونكە پێـویسـتـە عـەقڵ و سیـسـتـەمـەكە بگۆڕدرێت نەك وەسیلەكانی جێبەجێكردن. سـەرۆك بەش و بەڕێوەبەر تەنیا وەسـیلەیەكی جێبەجێكردنن و بەس.

- ئایا ئەمـەش هەر هیچ سـوودێكی نیـە ئەگـەر بۆ نموونە عـەمیـدێك یان بەڕێوەبەرێكی گشتی لاببەن و عەمـیدێك یان بەڕێوەبەرێكی گشـتیی دیكە لەجێی دابنێین؟

- بێگومـان نەخـێـر. تۆ سـەیركـە: هەمـوو عـەمـیـدەكـان و هەمـوو بەڕێوەبەرەكـانی گـشـتـیی پەروەردە خـاوەن بڕوانامـەی بەرز یان دكـتـۆرا یان پرۆفیسۆری بوون و زۆربەشیـان عادەتەن خاوەن ئەزموون، ئەدی مادام بۆچی هیچ ریفۆرمێك یان گۆڕانكارییەك، وا بۆ ماوەی پازدە ساڵ دەچێ نەهاتە جێبەجێ كردن؟ مەسەلەكە گۆڕینی شەخسەكان نیە (زۆربەشیـان پیرن)، مەسەلەكە گۆڕینی عەقڵ و سیستەمەكەیە؛ دەبێ عەقڵێكی تازە هەبێت و سیستەمێكی نوێ و هاوچەرخ بهێندرێتە مەیدانەكە.

- كەواتە، تەنانەت ئەوەش هیچ سوودێكی نیە ئەگەر بۆ نموونە سەرۆك زانكۆیەك یان وەزیرێك لاببەن و سەرۆك زانكۆیەك یان وەزیرێكی دیكە لەجێی دابنێین؟

– ئێمە ئەوا پازدە ساڵە سەرۆک زانکۆیەک لادەبەین و سەرۆک زانکۆیەکی دیکەی لەجیاتی دادەنێین و واتێدەگەین کە ئازادیمان لەگەڵ خۆمان هێناوە..

– وەزیرێک لادەدەین و وەزیرێکی دیکەی لەجێی دادنێین و واتێدەگەین ریفۆرممان کردووە..

– بێ خەبەرین لەوەی کە پێویستە پێش ئەم کارە و پێش هەموو شتێک سیستەمە کەودەن و مەنهەجە پیر و عەقڵیەتە بەعسی و نەریتە کۆنەکانی مەعریفە و ئەخلاق و سیاسەت و ئیدارە هەڵتەکێنین!

– بەڕاستی حەیف بۆ ناوچەی زانکۆ و کۆمیتەی زانکۆ، حەیف بۆ حزبەکان!

– بۆچی؟

– حەیفە وا بیردەکەنەوە کە ئەگەر بەڕێوەبەر و عەمید و مەمید یان وەزیر بگۆڕن ئەمە دەبێتە هۆی گۆڕانکاری و ریفۆرم.

– بۆ چما ناوچەی زانکۆ و کۆمیتەی زانکۆ بڕیار لەسەر ئەوە دەدەن کێ بکەنە عەمید و کێ بکەنە سەرۆک بەش و چ سەرۆک زانکۆیەک لەجیاتی ئەوەی پێشوو دابنێین؟

– بەڵێ، حیزب بڕیاردەدات. لەوکاتەشدا حیزب بێگومان پیرەکەرێک کە یەکیەتی بێت یان دەڵەقۆڕێک کە پارتی بێت، بەلایەوە زۆر لەپێشتر و گونجاوتر و زاناترە لەچاو مامۆستایەکی گەنجی زانای «بێلایەن» کە لەگەڵ داخوازییەکانی وەچەی نوێ و قوتابیاندایە و دەیەوێت ریفۆرمێک لە زانکۆدا بکرێ.

– بەڵام ئەمە مانای وا نیە کە مامۆستا و پرۆفیسۆرە پارتی و یەکیەتییەکان هەموویان پیرەکەر و دەڵەقۆڕن و بێ مستەوان. عەیبە بۆ تۆ، تۆ خۆت مامۆستای زانکۆیت و عەیبە بۆ تۆ کە هێندە دەمت پیسە و جنێو دەدەی!

– یاخیوون بەناو زمانیشدا دەڕوا. من و گەنجە یاخیبووەکان و قوتابیانی ناڕازی، لە وشە و زمان زیاتر هیچ ئامرازێکی دیکەی دەربڕین و هیچ دەسەڵاتێکی دیکەمان نیە. ئایا ئەوەشمان پێ بە ڕەوا نازانیت کە هیچ

نەبێ بە زمان خۆمان لەو تووڕەیی و یاخیبوونەی خۆمان بەتاڵ بکەینەوە؟ من بەپێچەوانەوە، بەئانقەست ئەم کارە دەکەم: پێم خۆشە و بەلامەوە گرنگە ئەو تووڕەیی و یاخیبوونە هەمیشە لەناو زمانیشماندا ڕەنگ بداتەوە و خۆی تەعبیر بکات. یاخیبوون، چۆن بەناو هۆڵی موحازەڕات و نادیی تەڵەبە و شەقامەکاندا دەڕوات پێویست وایە بەهەمان شێوە بەناو زمانیشدا بڕوات! لەکاتی تووڕەبوون و هاواری هەڵچوون و یاخیبووندا من ناتوانم بڵێم «ئەو جەنابی سەرۆک زانکۆیە» دەڵێم «ئەو پیرە کەرە کۆنە بەعسییە»؛ ناتوانم بڵێم «ئەو عەمیدە بەڕێزە«، دەڵێم «ئەو دکتاتۆرە ستالینییە»؛ ناتوانم بڵێم «کۆڕی زانیاریی کوردستان» دەڵێم «گۆڕی زانیاریی کوردستان»؛ ناتوانم بڵێم «ڕاوێژکارەکانی وەزیری پەروەردە و ڕۆشنبیری» دەڵێم «کاوێژکارەکانی وەزیری پەروەردە و ڕۆشنبیری»..
ئەمەش چونکە تەنیا ئەمان بەرپرسیار و تاوانباری یەکەمن لەو مەهزەلە ڕۆشنبیری و پەروەردەیی و زانکۆییەی ئەمڕۆ گەنج و قوتابییانی بەستەزمان بەدەستیانەوە دەتلێنەوە. ئەم زمانەی من، ئەگەر تۆ بە پیسی دەزانی، هۆیەکەی ئەوەیە کە بەناو واقیعێکی پیسدا تێپەڕیوە؛ بەڵام ئامانجەکانی: پاک، داهاتوویەکی زێڕەوشان و پڕ خێر و بێریان لێوە دەدرەوشێتەوە، داهاتووی ڕووناک و جوانی وەچەیەکی یاخی.
- من گوتم: مانای وا نیە مامۆستا و برۆفیسۆرە پارتی و یەکیەتییەکان هەموویان پیرەکەر و دەڵەقۆڕ و بێ مستەوان.
- زۆر ڕاستە، بەڵام لێم قبووڵ بکە منیش «ئەم جارە بەئەدەبەوە» بڵێم: هەر مامۆستایەک ئەگەر یەکیەتی بوو یان پارتی بوو مانای وا نیە دەبێتە سەرۆک بەش و عەمید و بەڕێوەبەر و تەنانەت سەرۆک زانکۆ و وەزیرێکی زانا و لێهاتوو! چونکە تۆش دەزانی، سەبارەت بەوەی ئەم توێژە وردە بۆرژوایەی مامۆستا و ڕۆشنبیران، مارکس گوتەنی (هەلپەرستن) و بەدووای بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیاندا وێڵن، نیوەی زیاتریان لەو جۆرانەن کە -بەپێی بارودۆخ و بەرژەوەندیی خۆیان - گێر دەگۆڕن.
- چی دەگۆڕن؟!
- قوربان، گێڕ! گێڕ دەگۆڕن یەعنی پێش ڕاپەڕین بەعسی و ڕەفیق

حیزبی و مەنسوولی بەعس بوون، کەچی ئەمڕۆ - چونکە باش لە گەمەکە دەزانن- بۆ خاتری ئەوەی پلە و پایە و کورسییەکانیان وەدەست بهێننەوە دێن دەبنە پارتی یان یەکیەتی! من چەندین بەڕێوەبەر و وەزیر و عەمید و سەرۆکی زانکۆ و سەرۆکی بەش دەناسم کە جاران بەعسی بوونە و ئەمڕۆ پارتین یان یەکیەتین، پێش ١٩٩٦ یەکیەتی بوون و ئەمڕۆ پارتین، پێش نازانم کەی شووعی یان پەکەکە یان ئیسلامی بوون و ئەمڕۆ یان یەکیەتین یان پارتین. هەرایە لە هەمزەبەگی: لەپێناو پلە و پایە و کورسی..

- ڕاستە، ئەم دیاردەیە یەکێکە لەو ڕەخنە زۆر توندانەی کە جەماوەر هەمیشە، هەر لە سەرەتای ڕاپەڕینەوە، ئاراستەی دوو حیزبە فەرمانڕەواکەی دەکات.

- ئەم دیاردەیە چی دەگەیەنێ؟ ئەوە دەگەیەنێ کە حیزبی دەسەڵاتداریش حەزدەکات ئەم جۆرە خەڵکە هەلپەرستە نەزان و پیر و گەلحۆیە لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە.

- بۆچی؟

- چونکە دەسەڵاتی تازە حوکم بەدەستەوەگرتوو هەمیشە لە زانست و ڕۆشنبیریی ڕەسەن و یاخی و ریفۆرمخواز دەسڵەمێتەوە. کەسانێکی پێویستە ملحیز ملحیز مەسئولێکی حیزب هەرچی فەرمایشت کرد، بەگوێی بکات. ئەم کەڵەپیرە هەلپەرستانەش باشترین و گونجاوترین دەست لەسەر سنگەکانن! هەر ئەمەیشە نهێنیی ئەوەی کە مودیرییەت و وەزارەت و زانکۆ و دەزگاکانی دیکە بەم نەوعە پیر و کەر و کەوودەنانە پڕ کراونەتەوە و گەنج و قوتابیە یاخیبووەکان دەچەوسێننەوە!

- من واتێدەگەم هەر ئەمەیشە هۆی ئەوەی کە گۆڕانکاری و ریفۆرمەکان تا ئێستا تەنیا لەئاستی گۆڕینی پلە و پایە و کورسییەکان دەکرێت و بەس..

- بەڵێ عەمیدێک لادەدەن و عەمیدێکی دیکەی لەجێی دادەنێن، وەزیرێک یان سەرۆک زانکۆ و سەرۆک بەشێک لادەدەن و وەزیرێک یان سەرۆک زانکۆ و سەرۆک بەشێکی دیکەی لەجێ دادەنێن..

- بەڵام گۆڕانکاری لە سیستەم و عەقڵیەت و مێتۆدەکان ناکەن، چونکە

لەوکاتەدا زۆربەی ئەو پیر و کەر و کەودەنانە دەبێ ناچار ناچار تەقاویت بکرێن یانیش لەئەنجامی ئەوەی کە دەرۆستی واقیعە زانستی و پەروەردەیی و زانکۆیی و ڕۆشنبیرییە تازەکە نایەن و تێیان ناگەن، وردە وردە خۆیان دەپووکێنەوە و لەناودەچن.

- کەواتە، ڕاستە: پێویستە عەقڵ و سیستەمەکە بگۆڕدرێت نەک وەسیلەکانی جێبەجێکردن.

- نایکەن چونکە هەموو ئەم نوقتە دەسەلاتە هەلپەرست و پیرانە (لە سەرۆک بەش و بەڕێوەبەرەوە بگرە تا دەگاتە عەمید و بەڕێوەبەرە گشتیی و وەزیرەکان و سەرۆک زانکۆکانیش) نایانەوێت و ناتوانن هیچ گۆڕانکارییەک لە عەقڵیەت و مێتۆد و مەعریفە و سیستەمەکەدا بکەن: چونکە هەر یەکێکیان لە خوارەوە لەلایەک بەرژەوەندیی خۆی تێکدەچی لەلایەکی دیکەشدا ملکەچی ئەوەی سەرووترە؛ ئەوەی سەرووتریش بە هەمان شێوە ملکەچی سەرووتری خۆیەتی.

- هەموو ئەم زنجیرە ملکەچییەشیان بە هەنجەتێک بەستۆتەوە و بە ڕەوایان کردووە کە پێی دەگوترێ «قانوون» یان (قانوونی ئیدارە) کە هیچ کەسێک و مودێرێک و عەمیدێک بۆی نیە سەربێچیی بکات ئەگینا دەردەکرێت.

- میشێل فۆکۆ ناو لەم پەیوەندییە ملکەچییە دەنێت «میکرۆفیزیای دەسەلات». چونکە پێی وایە هەموو ملکەچییەک بەزۆر (واتە بەپێی یاسا) بەشێوەیەکی ورد و میکرۆفیزیایی کە هیچ کەس بەئاسانی هەستی پێناکا بەستراوەتەوە بە ملکەچییەک بۆ سەرووتر ئەویش بۆ سەرووتر و سەرووتر و سەرووترین.

- جارێکیان لە حزووری جەنابی سەرۆک مەسعوود بارزانی دانیشتبووم، هەواڵی زانکۆ و باری زانکۆی لێ پرسیم، منیش زۆر ڕەخنەگرانە و ناڕازییانە باسی زانکۆم بۆی کرد و تێمگەیاند کە پێویستە ریفۆرم و گۆڕانکاری بکرێت، لە وەلامدا، زۆر خاکەڕایانە، تەنیا بە یەک جوملە وەلامی دامەوە گوتی(ئێمە پێشمەرگەین، ئەگەر پێمان بلێن: پێویستە ئەو

شاخە بگرین، دەتوانین بیگرین! بەڵام گۆڕینی سیستەمی زانکۆ و ریفۆرم لە زانکۆدا ئەوا ئێوە خودی خۆتان واتە مامۆستایان بەرپرسیارن).

- کەواتە پێویستە پێش هەموو شتێک قانوونەکان بگۆڕین، ناوەڕۆکی ئەو مەعریفەیە بگۆڕین و قانونی دیکەیان بۆ دابنێین.

- پێویستە ئەو گۆڕانکاری و ریفۆرمە لە خودی زانکۆوە، لەناو زانکۆوە یان لەناو پەروەردەوە دەست پێ بکات.

- بەڵام تۆ دەڵێی ئەم کارە مامۆستایان نایکەن، ئامادە نین بیکەن!

- بەڵێ چونکە زۆربەیان لە سەرووترەکانی خۆیان دەترسن و حەزناکەن بشێوی دروست ببێت، جگە لەمەش لە بەرژەوەندییاندا نییە. ئەوانی دیکەش پیرن و هەر ئەسڵەن باوەڕیان بە «جووڵە» نیە.

- باشە، ئەدی پێش ماوەیەک (لە ١٠/٤/٢٠٠٥) لە سلێمانی سەدان مامۆستا رژانە ناو شەقامەکانەوە و داوایان دەکرد ریفۆرمێک لە بەستێنی پەروەردەدا بێتە دی!

- ئافەرین بۆ ئەم مامۆستایانە، چونکە پێش مامۆستایانی زانکۆ کەوتن و لەم مەیدانەدا هەموومان دەزانین ئەمە یەکەم جارە ڕاپەڕینی مامۆستایان لە کوردستانی ئازاددا سەرهەڵبدات، بەڵام تۆش ئاگاداریت تا ئێستا هیچ وەڵامێکیان نەبوو!

- بەڵێ، چونکە ریفۆرم و گۆڕانکارییەکە لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی پەروەردە و وەزارەتی پەروەردە و سەرۆکایەتیی زانکۆوە پێویستە بکرێت!

- ئەدی بۆچی نایکەن؟

- چونکە زۆربەی مودیرەکان و سەرۆک بەشەکان و مودیرعامەکان و عەمیدەکان و سەرۆک زانکۆکان و ئەو مامۆستایانەی دەسەڵاتیان هەیە لە داخوازییەکانی قوتابیان و مامۆستای گەنج تێناگەن، یانیش پیرن و تاقەتی ئەم بەزمەیان نەماوە، یانیش کۆنەبەعسین، واتە عەقڵیەتی زۆربەیان خاوەن عەقڵیەتێکە کە ناوەڕۆکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی «داخل حسن» و «حمدیە صالح و بناتها..».

- مەبەستت ئەوەیە کە خاوەن عەقڵیەت و بیرکردنەوە و مێتۆدێکی کۆنن؟

- بەڵێ. مەسعوود محەممەد ئەمانە ناو دەنێت «جەندرمەی کۆنەپەرستی و تاریکبیری و پاشەکشە و ستەم».

- کەواتە، ئەم پرۆژەیە تەنیا تەڵەبە و وەچەی ئەمڕۆ خەباتی بۆ دەکەن و تەنیا ئەوان تێی دەگەن؛ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کەمی مامۆستایانی گەنج و یاخی و شایستە کە بەڕاستی مامۆستای ڕاستەقینە ئەوانن!

- من شتێکی دیکە دەڵێم.

- چی؟

- مامۆستاکان، کە لە خواری خوارەوەی هەموویانن، واتە لەبەرئەوەی لەبەر حوکمی قانوون و فەرمایشتەکانی هەموو ئەوانەی سەرەوەدان و لەژێر پاڵەپەستۆی هەرە خوارەوەی هەرەمەکەدان، لە هەموویان بەستەزمانتر و گوناحترن.

- نەخێر؛ مامۆستایان لە هەموویان دکتاتۆرترن.

- چونکە ئەوانیش داخی سەرەوەی خۆیان بە قوتابییەکانیان هەڵدەڕێژن؟

- ڕاستە.

- کەواتە قوتابییان و وەچەی نوێ لە هەموویان گوناحتر و مەزڵوومترن.

- بەڵێ.

- پەک!

- چی؟

- دەبینی چ ململانێ و زۆرانبازییەکی بێدەنگ و شاراوە لەم بەستێنەدا هەیە و کەسیش پێی نازانێ؟! بەڵێ. کەواتە، تۆ وایدەبینی کە مامۆستایان بەشێوەیەکی گشتی، شتێک لە هەڵپەرستییان تێدایە. ها؟!

- ئەگەر بەراوردیان بکەیت بە تەڵەبە، بەڵێ.

- بۆیەش هیچ یەکێکیان ئامادەییان نیە مان بگرن.

-مامۆستاکان؟

- بەڵێ مامۆستاکان و بەڕێوەبەرەکان و عەمیدەکان..

- ئەمەش چونکە، بە ڕای تۆ، لە سەنگەری دەسەڵاتدان دژ بە سەنگەری تەڵەبە.

- جگە لەمەش، خودی خۆیشیان بەشێکن لە مەکینەکە.

- کام مەکینە؟
- مەکینەی چەوساندنەوەی گەنج و تەڵەبە.
- یەعنی تۆ پێت وایە مامۆستا تەڵەبە دەچەوسێنێتەوە؟
- چەوساندنەوەیەکی مەعریفی و رۆشنبیری و .. شتی تریش... بێ ئەوەی باسی حەیزەران و قەصاص کردن و دەرکردن و بە زۆر یان بەئانقەست ساقیتکردنی تەڵەبەش بکەم! من پێم وایە: مامۆستا نەک هەر تەڵەبە دەچەوسێنێتەوە، بەڵکو تەڵەبە پێویستە مامۆستا بە دوژمنی خۆیشی بزانێت.

- تۆ چ بەڵگەیەکی دیکەت هەیە کە تەڵەبە لەلایەن مامۆستاوە دەچەوسێنرێتەوە و مامۆستا دوژمنی تەڵەبەیە؟!
- مامۆستایەک لەجیاتی رێی راست رێی غەڵەتت پێشان بدات؛ لەجیاتی رووناکی و جوانی و پێکەنین تاریکی و ناشیرینی و گرژی بخاتە دەروونتەوە؛ لەجیاتی فێرکردنی زانست و مەعریفە و هونەر ئەو شتانە بجوێتەوە و کاوێژ بکات کە تۆ بەدیاریەوە خەو بتباتەوە و پارەیش بەهۆی تۆوە وەربگرێت؛ ئەوە دوژمنی تۆیە! ئەو مامۆستایە دوژمنی تۆیە کە بێت وەک پۆلیس لە ئیستیعلامات بوەستێت بزانێت پانتۆرت لەبەرە یان تەننوورە؛ ئەوە دوژمنی تۆیە نەهێڵێت تۆ خۆت مامۆستای سەرپەرشتیاری باسی دەرچوونت یان باسی ماجستێر و دکتۆرات بەئارەزووی خۆت هەڵبژێریت؛ ئەوە دوژمنی تۆیە کە گوێت لێ رانەگرێ وەختێ بە خۆت و بە هەموو قوتابییەکانی دیکەی چەندین پۆلەوە پێی دەڵێن (تۆ مامۆستایەکی خراپیت و وازمان لێ بێنە) کەچی پشتیوانە هاوجۆر و هاوکارەکانی ئیدارە بەزۆریی زۆردارەکی هەر ئەوت بۆ بخەنەوە پۆل و تۆش بە گێرەشێوێن و بێ ئەدەب لەقەڵەم بدەن؛ ئەو مامۆستایە دوژمنی تۆیە کە بە تف و دار و جنێو و «دانیشە» و «نابێ» و «کتێب بۆ راوەشاندن» وەڵامی پرسیارەکانت بداتەوە؛ ئەو مامۆستایە دوژمنی تۆیە کە وات لێدەکات مەکتەب یان زانکۆ بەجێ بهێڵیت، ئەو مامۆستایە دوژمنی تۆیە کە وات لێدەکات لەداخی ئەو و لە حەژمەتان و لە ریسواییان نەوت بە خۆت داکەیت و خۆت بسووتێنی!

بەکورتی: ئەو مامۆستایە دوژمنی تۆیە کە ڕێگر بێت لەبەردەم پێشکەوتنی تۆ و خۆدەربڕینی تۆ و وەدیهێنانی ئاوات و ئارەزووەکانی تۆدا. ئازیزەکەم.. تۆ لەوە دەچێ ئاگاداری ژیانی تەڵەبە و مامۆستا نەبیت. دەزانی.. من.. حەزدەکەم کتێبەکەی مەسعوود محەممەد بخوێنیتەوە بە ناونیشانی (مرۆڤ و دەوروبەر)، جوملەیەکی زۆر جوانی تێدایە لەم بارەیەوە.

- چ دەڵێ؟

- دەڵێ: وا دەبێ ئەو ڕێبازەی کە مامۆستا و ڕابەر و هونەرکار بەسەریدا دەڕۆن، بەهۆی کۆن بوونییەوە، دەوری چاک و سوودبەخشیی بەسەردەچێت.. کەچی بەشی زۆری ئەو ڕابەرانە وەک سۆفی و دەروێش پەنجە لە زەرگ و تەپڵ و دەفە گیردەکەن.. بەشێوەیەکی جەزبەگرتووانە پێ لەسەر ڕاستبوون و پیرۆزبوون و دروستبوونی ڕێبازەکە دادەگرن و بە بەژن و باڵایدا هەڵدەڵێن؛ بەمەشدا بەیەکجارەکی لە نوێدۆستی و پێشکەوتنخوازی و خەسڵەتی ڕابەرایەتی دەتارێن و دەبنە جەندرمەی کۆنەپەرستی و تاریکبیری و پاشەکشە و ستەم.

**دەستگیریت لە عەمەلدا قەت نەکا مورشیدی پیر**
**دەستی تۆی گرتووە، پێی بەستووی مانەندی ئەسیر!**

حاجی



- تۆ بەڵگەی دیکەت هەیە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە مامۆستا تەڵەبە دەچەوسێنێتەوە و دوژمنی تەڵەبەیە؟!

- تازە هاتبوومەوە لە ١٩٩٤، مامۆستایەکی هاوکۆلێژم - لە ئاداب - دەیگوت: سوێندم خواردووە کە فڵانە قوتابی هەر دەبێ ساقیت بکەم! گوتم: بۆچی؟ گوتی: لەبەرئەوەی لەناو دەرسی خۆم بە چاوی خۆم دیومە خورمای دەخوارد! گوتم: ئێ خورما باشە بۆ بێدارمانەوە و زیندوومانەوەی مێشکی تەڵەبە هەروەها بۆ وەرگرتنی گەرمی بەم زستانە ساردەی ناو ئەم پۆلە سەهۆڵبەندانە! گوتی: نەخێر، دەبێ هەر ساقیتی بکەم! ..ساقیتیشی کرد! ئیتر دووای ئەم قسانەی ئەو، ئەوەم بیرهاتەوە کە من لەناو هۆڵی موحازەرەکانم (کە لە پاریس بوو) بەردەوام چایەک یان قاوەیەکی لیمۆناویم لەسەر مێزەکەم دانابوو، بەرامبەر مامۆستاکەشم دانیشتبووم و دەرسم دەنووسیەوە). من چۆن ئەم جۆرە مامۆستایانە بە دوژمنی سەرسەختی تەڵەبە نەزانم!؟

- بەڵام..

- تۆ، مادام بەناو ژیان و پەیوەندییەکانی نێوان مامۆستا و تەڵەبەدا قووڵ نەبوویتەتەوە، بەس برۆ مانشێت و دەنگوباس و هەواڵەکانی نێو رۆژنامە خوێندکارییەکان بخوێنەوە، ئنجا لەوە تێ دەگەی کە ئاخۆ تەڵەبە هەقیەتی مامۆستا بە دوژمنی خۆی بزانێت یان نا؟ لەسەر لاپەڕەی رۆژنامە خوێندکارییەکاندا، بە مانشێت، ئەم هەستی دوژمنایەتی و توورەیی و ناڕەزایی و هەستی تۆڵە و ئازار و داخوازییانە دەخوێنینەوە:

•

با مامۆستاکانمان تەمێ بکەین!

لە قوتابخانەیەکی (دینارتی) مامۆستایەک دەستی قوتابییەکی خۆی دەسووتێنێ

ئەو منداڵانەی لەترسی مامۆستا وازیان لە خوێندن هێنا

قوتابی بە ئارەزووی خۆی بەش هەڵنابژێرێت

زانکۆ بێکاری بەرهەم دەهێنێت

دەنگی جەنابی عەمید دەنگی کوڕە شێخێکە و قەبووڵ ناکات کەس لە کاروبارەکانی زانکۆدا قسە بکات.

لە قوتابخانەکاندا پارە لە قوتاتبیان وەردەگیرێت.

دەرکردنی قوتابی لە پۆلدا

گەرەنتیی تەندروستیمان (ضمانی صحی) ئەرکی حکوومەت و سەرۆکایەتیی زانکۆیە!

زانکۆ چەقی هەڵگیرساندنی شۆڕشەکانە

دەبێ حیزب بەند بکرێت نەک تەڵەبە!

مامۆستایانی ئێمە لەئاست گەیاندنی پەیامێکی ڕۆشنبیریی هاوچەرخدا نین

لە زانکۆی سلێمانی گرووپی هەڵوێست ناسنامەیان لێ دەسەندرێتەوە

بۆچی ڕێگە لە خۆپیشاندانی خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی گیرا؟

لە پەڕتووکی جوگرافیای پۆلی پێنجەمی سەرەتاییدا وەزارەتی

پەروردە دان بە کوردستانی بوونی کەرکووکدا نانێ

گۆڕینی ئیدارەی زانکۆ و سیستەمی خوێندن

قوتابیانی کۆلێژی زانست بەشی کیمیا مان دەگرن

قوتابیان ئەسیری کێشەی حیزبەکانن..

گۆڕانکاری لە سیستەمی پەروەردە و زانکۆیی ئەرکێکی زۆر پێویستە

١٣ ئەندامی لقی کۆمەڵەی خوێندکاران دەست لە کاردەکێشنەوە

لە دەربەندیخان خوێندکاران داوای لابردنی مزگەوتی نزیک قوتابخانەکەیان دەکەن

لە ڕاپرسیەکدا ٨٩/. ی گەنجان بێزار و نارازین لە ژیانی خۆیان

لە ولاتی ئێمەدا حکوومەت تا ئێستا بەرنامەیەکی بۆ دیموکراتیزەکردنی زانکۆ و پەروەردە ئامادە نەکردووە.

کۆمەڵێک نەوجەوانی هەولێر: لە کۆتاییدا هەموو گەنجی کوردستان دەبن بە پۆلیس

پێویستە ڕێگە لە قبووڵ خاص بگیرێت

تیرۆرستان دوو خوێندکار شەهید و دووانی تر بریندار دەکەن

قوتابیان بەشی ناوخۆییان نیە، هەندێکیان لە مزگەوتەکان دەخەون

کولتووری ئێمە کولتوورێکی ئیستیبدادییە

مامۆستای زانکۆ یان شوانی ڕانەمەڕ؟

لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین قەدەغەیە مامۆستا لەگەڵ قوتابی بێت!

پێویستە فێربوونی زمانی ئینگلیزی پەرەی پێ بدرێت و زیاتر بکرێت!

ژمارەی کتێبخانەکانمان بۆ زیاد بکەن!

ئاخ، نەخۆشخانە بۆگەنەکانمان!

مانگرتنی قوتابیانی کۆلێژەکانی ئەندازیاری و ئینگلیزیی ئێواران

لە دووانەوەندیی (زەڕایەن) بە تۆمەتی ئاژاوەنانەوە ٣٤ قوتابی نەقڵ دەکرێن

سیستەمی غیابات چارەسەرێکی جیددیی دەوێ

لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر کچ و کوڕ لەیەکتری جیا کراونەتەوە

له قوتابخانه و زانکۆکاندا لەپێکردنی پانتۆڵ بۆ کچان قەدەغەیە!

کەمیی بینایەی قوتابخانە لە شارۆچکەکاندا

کەمیی پۆل لە بەشەکاندا

خوێندکاری دێهات فەرامۆشکراوە

دەسدرێژی دەکرێتە سەر قوتابیان

تابلۆی ئازاد ئازادە بەڵام مانای ئەوە نیە ببێت بە بەرەڵایی!

خوێندکاران داوای پاککردنەوەی دەسەڵاتی حیزب دەکەن لەناو زانکۆدا

قوتابیانی زانکۆ داوای زیادکردنی دەرماڵە دەکەن

دیاردەی سواڵکردن و کلۆڵیی خانەنشینان

گەرەنتیی تەندروستیمان (ضمانی صحی) ئەرکی حکوومەت و وەزارەتی پەروەردەیە!

خوێندکاران داوای دابینکردنی پێداویستییەکانی بەشە ناوخۆییەکان دەکەن:
دابینکردنی سۆپا، نەوت، کومبار، قەروێلە، پەردە، دروستکردنی دەرمانخانە..

دابینکردنی پاس بۆ هاتوچۆکردنی قوتابیان

بەشە ناوخۆییەکانمان حەمامیان نیە

دەرگای بەشە ناوخۆییەکان لە کاتژمێر شەشی ئێوارەوە دادەخرێت

نەبوونی سەرچاوەی زانستیی نوێ لە کتێبخانەکاندا

دابینکردنی بنکەی ئەنتەرنێت لە هەر بەشێکی کۆلێژ و لە هەر بەشێکی ناوخۆییدا

بەرپرسی زانکۆ بە قوتابیانی بەشە ناوخۆییەکان دەڵێت «برۆ داوای سۆپە لە باوکت بکە!»

لەبەردەم زانکۆی سلێمانیدا چەند ئاسایشێک میلی دەمانچە لە چەند خوێندکارێک ڕادەکێشن و یەکێکیان دەسگیر دەکەن

ڕۆڵی زانکۆ ئیفلیجە

کێ بەرپرسیارە لە هەڵەی پرسیارەکانی پۆلی شەشەمی سەرەتایی ئەمساڵ؟

لە خۆپیشاندانێکدا لە زانکۆی سەلاحەدین قوتابیان داوای گۆڕینی ئیدارە و دابینکردنی دەرماڵە و سووتەمەنی دەکەن

کۆلێژی شەریعە بەرەو حەج دەڕوات

چەند ژمارەیەکی ڕۆژنامەی خوێندنی لیبراڵ دەستیان بەسەردا دەگیرێ

سەردان بۆ پەیمانگە و کۆلێژەکان قەدەغەیە

پەیمانگە وەک بەندیخانەی سەدە کۆنەکانە

لە هەرێمێکدا چوار شێوازی فێربوونی ئەلف و بێی پۆلی یەکەمی سەرەتایی

تاقیکردنەوە لە هەندێ کۆلێژ بە زمانی کوردی قەدەغەیە

ئەگەر نەخۆش بکەوین پێویستە حکومەت و سەرۆکایەتیی زانکۆ خەرجیمان بدەن و (ضمانی صحی)مان بۆ دابین بکەن.

بۆچی ڕێگە لە خۆپیشاندانی قوتابیانی زانکۆی سەلاحەدین گیرا؟

ئایا سەدان تەڵەبەی خەریجی کشتوکاڵ چ دەورێکیان هەبووە لە بەرەو پێشەوەبردنی کشتوکاڵی کوردستاندا؟

مەنهەج و موفرەداتی دەرسەکان هی ساڵانی حەفتان و پێویستە بگۆڕدرێن

نەبوونی سەرچاوە و کتێبی تازە

باسی دەرچوون (بحث تخرج) دەبێ ساڵێکی بۆ دابنرێت و

ببێته وەرگرتنی تایبەتمەندی

مەرجەکانی وەرگیران لە ماجستێر و دکتۆرا دادپەروەرانە نیە و بە فەرمایشتی حیزبەکان بەڕێوە دەچێ

ئەمرۆ سەرنوسەری ڕۆژنامەی (ئەمرۆ) دادگایی دەکرێ

خەریج پاقلە دەفرۆشێ یانیش تەکسیی هەیە

تەنیا ڕۆژانی هەینی بوارمان هەیە، کەچی لەو ڕۆژەشدا کتێبخانەیان داخستووە!

پێویستە مەڵبەندی فێربوونی زمانە ئەوروپاییەکان لە کوردستاندا بکرێنەوە!

ئەم مانشێت و هەواڵانە لەم ڕۆژنامە گەنجانە و خوێندکارییانەی خوارەوەدا بڵاوکراونەتەوە لە ماوەی ساڵانی (٢٠٠٤- ٢٠٠٥)دا: مەکۆ، ڕووانین، ئاڤێستا، شوناس، هاوڵاتی، خوێندنی لیبراڵ، گۆڕان، زەنگی زانکۆ، دیدی نوێ..

ئەم مانشێتانە، کە مشتێکن لە خەروارێک، باسی ژیانی نالەباری خوێندکار و لاوانی کوردستانت بۆ دەکەن، چیرۆکە مەرگەساتاوییەکانی ژیانی قوتابی و گەنجانت بۆ دەگێڕنەوە؛ ئەوەت بۆ باس دەکەن کە پێویستە ڕاپەڕینێکی ئەم توێژە بێدار و شکۆمەندە بێچارەیە بکەوێتە سەر پێ! وەکو گوتم: ئەم توێژە ستەملێکراوە لەخۆوە نیە، بەپێچەوانەی توێژی مامۆستاکانی خۆیان، - لەخۆوە نیە کە دەیان گۆڤار و ڕۆژنامە و هەفتەنامەی هەیە! ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە هوشیارییەکی بێزار، بێدارییەکی تووڕە لەنێویاندا وەکو بورکان قوڵپ دەدات و ڕۆژێک دادێ هەموویان پێکەوە دەتەقنەوە، هەموویان پێکەوە لەژێر ئاڵایەکی ڕەشدا

دەڕژێتە سەر شەقامەکان و دروشمی برادەرە دێرینەکانی خۆیان دووپات دەکەنەوە- بە هاوار:

«پیرۆز» دوژمنی ئێمەیە...

مێشکتان و زنجیری پانتۆڵەکانتان.. بکەنەوە!

چیتر جەنتا و تەباشیر مەگرنە دەست؛ دەسەڵات بگرنە دەست!

ڕێزگرتنی لەخۆگەورەتر نەما چیتر بەدوو‌ایدا مەگەڕێ!

گەشبین بوونیش هەر گووە و بەگەلک نایە، بجوولێ! ژیان بگۆڕە!

کەمێک بە گوێ نەکردن، دەبێتە زۆرێک دەسکەوت

چیتر خۆتان ناڕەحەت مەکەن؛ خەلک ناڕەحەت بکەن!

گوو لە کۆمەلگە دەکەم .. ئنجا دلم خۆش دەبێ

ئێمە سەرقالی دنیایەکی تازە و ڕەسەنین، خەیاڵ خەریکە دەسەڵات دەگرێتە دەست..

# پەنجەرەی زۆر گەورە
# بە بەردێکی بچووک دەشکێ

بە قانوونیش مووەزەف گەییە حەددی خۆی، تەقاویتە
تەمای چیمان هەیە، تاکەی بژی شیعری من و زێوەر؟
شێخ نووری شێخ ساڵح



ئەمەیە هەقیقەت و حاڵی پەرلەمانتارانی پیری کوردستان
کە بوونەتە مایەی گاڵتەپێکردن
لەلایەن نەوەی نوێی گەنج و قوتابیان و ڕۆژنامەنووسە لاوەکانەوە

مادام سەربەخۆیی کوردستان و دادپەروەری - وەک چارەنووس و خۆزگە و ئارەزووەکانی ئەو هەموو هەزاران قوتابی و گەنج و خوێندکارانەی کە ساڵانە قوتابخانە ئامادەییەکان و پەیمانگەکان و زانکۆکان تەواو دەکەن - لەپێ کراون؛ مادام وەزارەتەکان و دامودەزگاکان و ئەو هەموو حیزبە نیشتیمانیە- وەک ئەو هەموو زرتە ڕۆشنبیر و مامۆستای زانکۆ و ڕۆژنامەنووسە عەلمانییانە - هیچیان لە بەستێنی ریفۆرم و گۆڕانکارییەکاندا پێ ناکرێت؛ مادام داهێنان و شەرەفمەندی و ڕێزگرتن و بەهرە و تواناکان - وەک ئەو ئافرەتە بێچارانەی لەدووای ڕاپەڕینەوە دەستیان داوەتە کاری قەحپەیی - هیچ حسێبێکیان بۆ ناکرێت و هیچ باداشتێکیان نادرێتەوە.. کەواتە تەنیا (یاخیبوون) و (ڕاپەڕینێک) دەتوانێ بەهای گەنج و ئازادییەکانی، مافەکانی قوتابی و سەربەستییەکانی بگەڕێنێتەوە و هیچی تر.

هەموو بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارەیەک، لەناو نادیی کۆلێژ و سەرجادە و پەنادیواری مزگەوت و چایخانە و فولکەی ناوبازاڕەکان و هەندێ جاریش لەناو مەڵبەندە ڕۆشنبیرییەکاندا، خوێندکارەکانمان، گەنجەکانمان، قوتابییەکانمان - کە هیچی ئەوتۆیان نیە بیکەن؛ دێن گوناح گوناح خۆزگە و خەونەکانی خۆیان بۆ یەکتر دەگێڕنەوە.

بێبەش لە هەموو خۆشی و ماف و ئازادی و سەفەرێک، هەڵزڕاوی نێوان بەرداشەکان، هەڵپڕووکاوی نێو ڕۆتین و واجیبات و سەغڵەتی و بێتاقەتییەکان؛ قوتابی و گەنجی ئەمڕۆ، تەنیا خەونیان بەدەستەوە ماوە: ئەو خەونانەی، وەک مرواری، لە قووڵترین پنتی بێزارییەکانی خۆیاندا خەویان لێکەوتووە و خەون دەبینن...

مەرگەسات لەوەدایە کە هەرگیز نەشهاتوون لەم خەونەی خۆیان قووڵ ببنەوە و بیروێنن! هەرگیز نەشیانتوانیوە بێن خۆیان فێر بکەن چۆن بتوانن جەسارەت بکەن ئەم خەونەی خۆیان بکەنە عەشقێک، ڕاپەڕینێک، یاخیبوونێک!

هەمیشە، تەنیا ئەو ستەم و ڕۆتین و ڕووکەشی و هیلاکی و مەعریفە کۆنە دەتفێنێتەوە کە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ جوویبوونی..

نەوجەوان: بێزار بێزار، هەر ئێوارەیەک لە چایخانەیەکدا ئەزنیف، لە سینەمایەکیشدا فیلمێکی ڕووت، چاوەڕێی دەکا..

قوتابی: هیوادار هیوادار چاوەڕێی نەورۆز و یازدەی ئازار و هەشتی شوبات و ژنهێنانی کوڕەمامێک یان شووکردنی کچەخاڵێکە کە بتوانێ «هەندێک ئاسمانی ساف» هەڵمژێت و بۆنی چاوی «کچێک» بکات..

گەنج: بێ تاقەت بێ تاقەت هەر ئێوارەیەک چاوەڕێی تازیە و پرسەیەکی دیکە دەکات بچێت فاتیحەیەکی لەسەر بخوێنێت..

خوێندکار: گوێڕایەڵ گوێڕایەڵ دانیشتووە پرچی داپیرەی جەبر و مەدخەل و عەرووز و قیاس و تەقویمەکان دەهۆنێتەوە..

بە هەمان شێوە، هەموو ڕۆژ: هەموو بەیانییەک، هەموو نیوەڕۆیەک، هەموو ئێوارەیەک، هەموو شەوێک.. هەمان شریتی کۆنە و لێی دەداتەوە و دێتەوە بەرچاوی... ئەمە لە حاڵەتێکدا، خۆیشی باش دەزانێت: جوینەوەی بەردەوام بەردەوام ئەم ڕۆتین و واجیبات و سەغڵەتی و ستەم و گوێڕایەڵی و ڕۆتین و ڕووکەشی و هیلاکی و مەعریفە کۆن و بێتاقەتانە: تەنیا خولانەوەیەکی بێهوودەیە لەناو هەمان بازنەی بۆگەنی بێ ماناییدا.

قوتابی و گەنجی ئەمڕۆ زۆر بەلایەوە ناجۆر و ناوێزەیە - تەنانەت ئەگەر بۆ خۆیشی حەزبکات- بێت خۆزگە و خەون و ئازادی و ئارەزووەکانی خۆی دەرببڕێت و دنیا کەپتکراوە شەخسیە «جوانەکان»ی خۆی بتەقێنێتەوە! لەم کاتانەدا (وایان ڕاهێناوە و وایان فێرکردووە) وەک ئەوەی هەست بکات کە ڕووبەڕووی «لادانێکی ئەخلاقی» یان نزیکی «تاوانێک» دەکەوێتەوە! دوودڵ، شەرمنۆک: باشە چۆن بچێ بوێرێت کارێک بکات کەس نەیکردبێت؟ چۆن بچێ بوێرێت باس لە «جیهانێکی پڕ خۆزگە و تووڕەیی و هەوەس و ئارەزوو» بکات کە کەس هێشتا پێش خۆی دەرینەبڕیبێ؟! چۆن جورئەت بکات وشە و دەستەواژە و زاراوە و زمانێک دەکاربهێنێت کە لە واقیعدا تا ئێستا نەبۆتە باو؟ ئەدی نابێ پێش ئەو، کەسێکی تر ئەم کارەی کردبێت و لەلای خەڵک پەسەندکرابێت و بووبێتە شتێکی باو؛ ئنجا ئەو بێت کارەکە دووپات بکاتەوە؟!

ئەم حاڵەتی ترسنۆکی و بێ تاقەتی و ڕاڕاییە، بەداخەوە، سیفەتێکی زۆر دێرین و تۆزلێنیشتووی گەلی کوردە؛ دیارە ڕۆشنبیر و ژن و پیاوە گەورەکانیشمان هەر لەم سیفەتە بێبەش نین. ئەولیا چەلەبی نزیکەی پێنج سەد ساڵ بەر لە ئەمڕۆ ئاماژەی بۆ ئەم سیفەتی نەوێران و تەمبەڵی و ترسنۆکییەی کورد کردووە، لە سەفەرنامەکەی خۆیدا (چاپی سەعید ناکام، لاپەڕە ٨٣) دەڵێ:

«ئەگەر جغزێک بە دەوری کوردێکدا بکێشی، بشمرێ لەو جغزە نایەتە دەرێ: هەتا یەکێک نەیێ لایەکی جغزەکەی بۆ تێک بدات».

کەواتە، یەکێک لە هۆیەکانی مەرگەساتی گەنج و قوتابیی ئەمڕۆی کورد لەوەی کە ناتوانێ فێر ببێت چۆن ئازاد و ئاسوودە و سەرفراز بژیت، ڕەنگە ئەوە بێت کە ئەو، بەدرێژایی مێژوو، لە ناهوشیاریی گەلەکۆیی (اللاشعور الجمعی) خۆیدا، هەرگیز بەوە ڕانەهاتووە کە یاخی بێت، یاخی بێت بۆئەوەی ئازاد بیربکاتەوە، ئازاد بیربکاتەوە بۆئەوەی ئازاد ببێت، ئازاد ببێت بۆئەوەی ئازاد بژیت، ئازاد بژیت بۆئەوەی هەموو کۆمەڵگەکەیشی ئازاد و ئاسوودە و سەرفراز بژین! بەوە ڕانەهاتووە خۆی ببینێت توانیوەیەتی دەسپێشخەرە! بەوە ڕانەهاتووە کە شەخسی خۆی بێت، شەخسیانە بژیت، شەخسیانە بیر بکاتەوە.

لەلایەکی دیکەشەوە، نەیوێراوە بتوانێت بزانێت چۆن بگاتە ئاستی باوەڕهێنان بە هێزی خۆی، نەیوێراوە بزانێت چۆن بگاتە ئەو ئاستە بڵندەی کە بتوانێت باوەڕ بەوە بێنێت کە سەرچاوەی پێشکەوتنی خۆی و ئاسوودەیی و داهێنان و گەیشتنە جوانی و چێژ و عەشق و دڵخۆشییەکان و ڕەهابوون تەنیا لە قووڵایی شاراوەی خودی خۆیدایە، نەک لە دەرەوەی! ئەگینا، ئەولیا چەلەبی گوتەنی: بۆچی تاقەت و هێزی ئەوەی نیە کە ئەو جوغزەی بە دەوریاندا کێشاوە بیشکێنێت و لێی بێتە دەرەوە؟

ئنجا کەواتە گەنجی کورد چۆن فێری ئەوە دەبێت «جوغزەکەی خۆی» بشکێنێت و لە جوغزەکەی بێتە دەرەوە» ؟! کەی فێری ئەوە دەبێت بتوانێت بوێرێت چۆن بزانێ بگاتە ئەو ئاستەی باوەڕهێنان بە هێزی خودی خۆی بۆ ڕەهابوون؟

لەناو ئەم شەرم و نەوێری و ڕاڕایی و کۆیلەیی و بێزاری و ستەمەی تێیدایین، تەنیا ئەم ئەم شەرم و نەوێری و ڕاڕایی و کۆیلەیی و بێزاری و ستەمەیشە کە دەمانگەیەنێتە ئازادی و سەرفرازییەکان. تەنیا ئەم شەرم و نەوێری و ڕاڕایی و کۆیلەیی و بێزاری و ستەمەیشە کە هەموو دەرگاکانی خەون و خود و هوشیارییە جوانە خەفەکراوەکان بۆ ئەو گەنجانە دەخاتە سەر پشت کە واتێگەیشتوون: دەستەکانی شەو قرچۆکن و پڕن لە بەتاڵی و تاریکی.

- چۆن؟

- کاتێ تۆ دەوێریت یاخی ببیت، کاتێ تۆ دەوێریت بەپێچەوانەی حکومەت و ژینگە و حزب و دام و دەزگاکەت و مودیرەکەت و مامۆستاکەت و سەرۆک بەشەکەت بیربکەیتەوە و ڕەفتار بکەیت، کاتێ تۆ دەوێریت بەپێچەوانەی گەورەکانت و کۆمەڵەکەت، خۆت بیت؛ ئیتر ئەم وێرانە جێژووانی بووژاندنەوەی هەموو توانا و بەهرە و ڕاپەڕین و یاخیبوون و ئازادییەکانتە! لەوکاتەدایە کە تۆ چیتر ئەوەندە پێویستیت بە ڕاوەستانی سەرجادەکان و پاڵدانەوەی پەنادیواری مزگەوتەکان و لەوغەی ناو چایخانەکان و ڕاوەستانی ناو فولکەی بازاڕەکان و دۆمینە و تاوڵە و دوو شەشی تۆپیو نامێنێ! لەوکاتەدایە کە تۆ چیتر هێندە پێویستیت بە قومار و جگەرە و عارەق و ماستاوکردن و پیاهەڵدانی حزب نامێنێ؛ لەوکاتەدایە کە تۆ چیتر مننەتت بە هیچ - بە هیچ نامێنێ: تەنێ بە خودی خۆت و خۆشەویستەکەت و هاوڕێکانت! پێم وابێ ناصر خسرو لە کاتێکی ئاوهادا گوتوویەتی (ئەم دنیایە هەرگیز نەیتوانی بکات ئەسیرم : چونکە من بەسەر نەفسی خۆمدا ئەمیرم):

اسیرم نکرد این ستمکاره گیتی
زیرا که من بر نفس خویش امیرم

ئەو گەنجانەی تر دەوێرن، بۆیە قوزکێشی بۆ کەس ناکەن و چاویان هەتا دەمرن لە دەستی باوکیان و لە دەستی هیچ کەسێکی دیکە نیە، ناشچن ناوی خۆیان لە هیچ لیستێکی سەرهەڵگرتن بۆ ئەوروپا بنووسن و کەمتریش خۆیان بە عارەقخواردنەوە سەرخۆش دەکەن..

یاخیبوون کە بنەمایەکی گرنگ و بنچینەیی ئازادبوون و ڕەهایی و سەرفرازییە، جمکانەی خۆزگە و کەڵکەڵە و ئارەزووەکانی گەنجانە، دینامیکییە، وەک مەرەقی نوێگەری، هەمیشە دووبارە دەبێتەوە و لە هەر سەردەمێکدا خۆی بەشێوەیەکی تازە، تازە دەکاتەوە. با لە ڕۆحی سەرکەشی شوکری فەزڵی وردببنەوە، کاتێ تووڕە دەبێت و لەدەست ستەمی کۆمەڵ یاخی دەبێت چ دەڵێ:

من بە ئاشووبم، بە جارێ خان و بانووتان ئەگێم
ئیبنی مەشهوورتان دەیووس و بەدخووتان ئەگێم
هەر لە کوڕ تا کچ، لە ساڵی سەد هەتا دووتان ئەگێم
یەک بە یەک هەمسایەکانی دەوری خانووتان ئەگێم.

وێران و یاخیبوون مەبدەئی ئازادین، هی هەمووان و لە هەر سەردەمێکدا. هەر کەسێک لە هەر سەردەمێکدا بۆ ئازادبوون و ڕەهایی خۆی بەکاریان دێنێ. یاخیبوون ئیلتیزام نیە، بەڵکو ڕەهابوونە؛ ڕزگاربوونە لەدەست «جغزەکەی ئەولیا چەلەبی» کە کوێرەگرێی هەموو کێشەکانمانە.

هەر لەم ڕووانگەیەوە، ئەمڕۆ، ئێمەی باوکەکان، ئێمەی مامۆستاکان، هەموو ئێمەی گەورە و پیر، هەر لە ئێستاوە، دەبێ دان بەوەدا بنێین و بزانین کە ئێمە -لەچاو نەسلی نوێ و لەپێناو داهاتووی گەنج- گەوجترین و گەمژەترین سەلەفییەکانی سەردەمی خۆمانین؛ ئەمەش چونکە نەوەی تینووی ئەمڕۆ و نەوەی دووای ئێمە، پێویستە بەسەر ئێسک و پرووسکی ئێمەوە بگەنە ئاو.

پیاوی گەورەی مەرد، مامۆستای مەزنی لەخۆبوردوو، لەوە سڵ ناکاتەوە کە ئەمڕۆ یان سبەینێ، گەنجێک یان خوێندکارێکی لە خۆی بەتواناتر دێتە مەیدان و دەچێ «بتی ئەو» بەردەداتە خوارەوە. لەوە ناترسێ گاڵتە بە عەقڵ و ئیمان ونەریتەکانی و سیستەمی بیرکردنەوەی بکرێت: چونکە ئەو بۆ خۆی تێر تێر ژیاوە و زۆری کردووە و بێ مننەتە. بۆیە هەر بێ مننەتانەش لەبارەی حاڵی حازر و واقیعی ئێستا یان داهاتووی خۆی قسە دەکات؛ بێ مننەتە لەوەیش کە ئاخۆ نەوەی ئەمڕۆ یان داهاتوو چیی پێ

دەڵێین و چۆنی هەڵدەسەنگێنن؟ لە حوکمدان و قەزاوەتەکانی نەوەی ئەمڕۆ و داهاتوو هەرگیز ناترسێ:

تڕی ئەولادی ئەم عەصرە بە کێرم
کە من مردم مەگەر گوو بکەن بە خێرم

ئەم شیعرە، بێگومان شاعیرێک نووسیویەتی کە باش دەزانێ خۆی مەرد و ئازاد و سەرفراز بووە؛ ئیتر بێباکە لەوەی کە نەوەی نوێ و دووای خۆی چیی پێدەکەن و چیی لێدەکەن و چ تازەگارایییەکی دیکەی دەخەنە سەر.

ئەو کەسەی خوانی لەبۆ دێ سوبح و شام
چیی لە ئێمە زیاترە: غەیرەز کەری؟

ڕاشکاوانە دەڵێم: هەمــــوو وەزارات و بەڕێوەبەرایەتی و زانکۆ و قوتابخانە و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و زانست و ڕۆشنبیری و پەروەردە، لەدەست کۆمەڵێک زەوقی کۆن و عەقڵی پیردان، ئەو زەوقە کۆن و عەقڵە پیرانەش هیچ حسێبێک بۆ خەون و خۆزگە و خۆشەویستی و عەقڵ و داهێنان و زیرەکی و بەهرە و تواناکانی گەنج و قوتابیان ناکەن.

ئەو مورشید و مەلا و مامۆستا و پیرانە، دەیانەوێ خەڵکی دیکەش بخەنە ناو هەمان «جغزەکە»؛ تەنانەت دەیانەوێ، بە ئەنواع و ئەشکال، میانەی نێوان گەنجەکان و لاوان، میانەی نێوان خوێندکاران و قوتابیان تێک بدەن یان بەهۆی «پارە» و «ڕێکخراوی حیزبی» و ئیمتیازاتی تر و پایە و وەزیفە و شتی ترەوە، ناچاریان بکەن بۆ لای خۆیانیان ڕابکێشن یان دووبەرەکی بخەنە ناویانەوە، تەنانەت هەتا پێیان دەکرێ دەچن کچ لە کوڕ، دەست لە گوڵ، نیگا لە جوانی، دوور و دوورتر دەخەنەوە!

ئەو مورشید و مەلا و مامۆستا و پیر و پرۆفیسۆرانە، حکوومەت و وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکان و زانکۆکان و مزگەوتەکان و دەزگا جۆراوجۆرەکانی دیکە، بەداخەوە، پشتگیری و هاوکاری و پشتیوانییەکی بێ هاوتایان لێدەکەن. ئەوانیش ئیتر بۆ خۆیان شەهادەی پرۆفیسۆری و

دکتۆرا و زانکۆ دەکەنە بەڵگەی ڕاستبوونی بڕیارەکانی خۆیان، پایە و ئەکادیمیەت دەکەنە هەنجەتی لەسەرهەق بوونی خۆیان، پیری و ڕیش و عەینەگ و گۆچان و کۆخەکۆخ و مافی بەڵغەم تێگرتن و کتێب تێگرتن دەکەنە پاساوی ئەوەی پێویست بێت تا هەتایە ڕێزیان بگریت و لەبەریان هەڵبستیتەوە! - هەرگیز سڵیش لەوە ناکەنەوە، هێندەی پێیان بکرێ، تەنیا کۆنەخوازی و کۆنەخوازەکان، بە هەرچی شێوەیەک بێت، بڵند ڕابگرن؛ پڕۆپاگاندەیان بۆ بکەن، خەڵاتیان بدەنێ، نازناوی «گەورەترین» و «هەرە گەورەترین» بە بالآیان ببڕن، لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و سەتەلایتەکاندا هێندە شیرین و بەرز و موهیمیان بکەن، کە خەڵک، لە دەرەوە، هەر حەزبکات ڕەسمیان لەگەڵ بگرێت! هەموو ئەمانەش، بۆئەوەیە کە بتوانن زەمینە خۆش بکەن بۆئەوەی بڕیاری مێژوو هەر بەلای بۆچوونی خۆیان و بۆ «پیر» بشکێتەوە.

ئەم میر و مەلا و مامۆستا و پیر و پرۆفیسۆرانە، بەو هەموو هێزە لەبن نەهاتووەی خۆیانەوە، کە هەمیشە توانای ئەوەیان هەبووە توانا و بەهرەکانی ئێوەی گەنج و قوتابی هەڵبمژن؛ لە هەمان کاتدا هەموو نەخشە «مەعریفی» و «ئێستەتیکی» و سیستەمە «ڕۆشنبیرییەکان» تەنیا خۆیان دایدەڕێژن و بەسەر ئێوەدا پیادەی دەکەن؛ ئەمانە تاقمێکن. تاقمن! زۆر بەداخەوە، حکومەت و حزبەکانیش، بە پیسترین شێوە، پشتیوانیی ئەم تاقمە دەکەن، بەشێوەیەک کە گەنجی تووڕە و یاخی واهەست بکات هەموویان پێکەوە تاقمێکی ستەمکاری گەورە و هاوکارن.

باشە کەواتە، خوێندکار و گەنج، یان ئەوانەی دەیانەوێ لە جغزەکەی «ئەولیا چەلەبی» ئازایانە بێنە دەرەوە، لەکوێ بژین! چ بکەن؟ چۆن بتوانن شەخسیەتی خۆیان و ئازادی و مافەکانیان بەرجەستە بکەن؟

لە زەمانی بەعس، ڕامان دەکرد و دەچووین دەبووینە پێشمەرگە؛ ئەدی ئێستا ببینە چی؟ ببینە پۆلیس؟ بێگومان نەخێر.

لە زەمانی بەعس، ڕامان دەکرد و دەچووینە ئێران، لەوێشەوە سەری

خۆمان هەڵدەگرت و دەچووینە ئەورووپا. ئەدی ئێستا چ بکەین؟ ڕابکەینە ئەورووپا و لەوێ چاوشۆڕ ببینە «پەناهەندە»؟ بێگومان نەخێر.

لە زەمانی بەعس، دەچووینە ناو ئاودەستخانەی مزگەوتەکان و دەوراندەوری دیوارەکەیمان بەکاردەهێنا: چی ڕەخنە و حەژمەت و جنێو هەبوو بە حکوومەتی بەعسمان دەدا، دیواری ئاودەستخانەی مزگەوتمان دەکردە تابلۆی ئازاد و پڕمان دەکرد لە خەونە کەپتکراوەکانی خۆمان و گەلّ و گونمان. ئەدی ئێستا چی بکەین و بۆ کوێ بچین؟ حەژمەتی خۆمان و گەلّ و گونمان دیسان هەر لەسەر دیواری مزگەوت و نادیی کۆلێژەکاندا بنووسینەوە؟ دیسانەوە بچینەوە ناو ئاودەسخانەی مزگەوتەکان؟ بێگومان نەخێر.

بەپێچەوانەی میر و مودیر و مەلا و مامۆستا و پیر و پرۆفیسۆرەکانەوە، ئێوەی گەنج و قوتابیانی ماندووی نێو «جغزەکەی ئەولیا چەلەبی» لەڕووی هێز و تەکنیک و تواناتانەوە لاوازن. کەواتە، ئێوەش، ئێوەی کۆیلە و دەستبەستراوی نێو «جغزەکە»، ئێوەی تەنیا باڵ، ئێوەی بەستەزمان، لە هەموو شتێک زیاتر پێویستیتان بە یەکگرتن هەیە. لە هەموو کەسێک زیاتر پێویستیتان بە گرووپ هەیە. زۆریی ژمارەتان و بڕواتان و هێزە کەپتکراوەکانتان و یاخیبوونتان، گەرەنتییە بۆ سەرکەوتنی ڕاپەڕینەکانتان لە داهاتوودا..



# درۆیە، داری گەورە وەک ئەمامی تازە دانایە..

حاجی

گەنج و قوتابیانی فەرەنسا، پێش ساڵی ١٩٦٨، هەمان مەرگەساتی ئێوەیان هەبوو، لە هەمان دۆخ و دۆزەخی ئێوەدا دەژیان؛ بەڵام لە مایسی ساڵی ١٩٦٨، چەند قوتابی و گەنج و خوێندکارێک خۆپیشاندانێکیان سازدا، پاشان چەندێکی دیکەش چوونە پاڵیان و خۆپیشاندانی گەورەتری دووەم سازدرا.. لەکۆتاییدا خۆپیشاندان و مانگرتن و ڕاپەڕینی گەنجان و خوێندکاران سەرجەم پاریس و ئنجا سەرجەم وڵاتی تەنییەوە: تا لەکۆتاییدا سەرکەوت و بووە مایەی گۆڕانکاری و ریفۆرمێکی سەرتاپایی لە فەرەنسا.

گورزی یەکەم و هەرە کوشندەی خۆپێشاندانەکان لە ٣ی مایسی ١٩٦٨ لە پاریس دەستی پێکرد، کاتێ قوتابیانی زانکۆی سۆربۆن سەرتاپای زانکۆیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. بەڵام پێش ئەمەش، قوتابیانی فەرەنسا لە هەردوو شاری (نانتێر) و (کان) لە ٨ و ١٩٦٨/١/٢٦ بەملاوە (دووای دەرکردنی قوتابیەکی جوولەکەی فەرەنسی بەهەنجەتی ئاژەوەگێڕی لە فەرەنسا) کەوتبوونە مانگرتن و دەربڕینی ناڕەزاییەکانی خۆیان.. ئنجا لە ڕۆژی ٢٢ی مارسدا لە شاری (نانتێر) گەیشتبووە شەڕ و پێکدادان لەنێوان قوتابیان و هێزەکانی ئاسایش - پۆلیس.

ئەم ڕاپەڕینە خوێندکارییە هەژەندە، شتێک لە مارکسیزم و کەمێک لە ماویزم و هەندێک لە وجوودییەت و زۆریش لە تاکەکەسگەرایی و ئەنارشیزمی تێدا بوو؛ وایکرد کە فەرەنسا -پاشانیش هەموو ئەورووپا- لەسەر شۆستەی مانگرتن و خۆپیشاندانەکانی گەنج و قوتابیاندا خەبەری بێتەوە!

خۆپیشاندانەکانی قوتابیان و گەنجان لە فەرەنسا، کە لە کۆتاییدا زۆربەی توێژە زەحمەتکێشەکانی کۆمەڵ و تەنانەت هەموو سەندیکاکانیش چوونە ژێر ئاڵاکەیەوە، لە ئاستی سیاسیدا، ڕۆڵیان بینی بۆ وەرگەڕانی

کورسییەکەی ژەنەڕاڵ شارڵ دی گۆل لە نیسانی ١٩٦٩؛ لە بواری ئابووریشدا بوونە هۆی ئاڵوگۆڕێکی باش لە ژیانی ئابووری و خۆشتربوونی ژیانی دارایی خەڵک؛ جگە لەمانەش لە بواری ژیانی ئەخلاقی و ڕۆشنبیریشدا گوززێکی بەزەبر بوون.. بەشێوەیەکی گشتی ریفۆرمێکی فراوانیان لە هەموو بەستێنەکانی ژیانی فەرەنسادا هێنایەدی.

ڕاپەڕینی خوێندکاران لە ساڵانی ١٩٦٨- ١٩٦٩ (کە هەندێک جار بە شۆڕشی قوتابیانیش ناو دەبرێت) لە سەرەتادا لە فەرەنسا دەستی پێ کرد، پاشان چیکۆسلۆڤاکیا و ئەڵمانیا و ئەمریکا و وڵاتانی دیکەیشی لە ئەورووپا گرتەوە. ڕاچڵەکین و واگاهاتنەوە و ڕیفۆرم و گۆڕانکارییەکی مەزنی لە هەموو بەستێنەکانی ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی ئەورووپا بەرپا کرد.

ئەو دروشمانەی کە خۆپیشاندانەکانی گەنج و خوێندکاران بەرزیان کردبۆوە لە مایسی ١٩٦٨دا، پڕ بوون لە یاخیبوون و ڕەفزکردنەوە و بەگژداچوون؛ داخوازییەکانیان لەناو شەقامەکاندا و لەبەردەم پەرلەمان و زانکۆ و وەزارەتەکاندا بڵاودەکردەوە؛ پڕ بە ڕۆحی خۆیان هاواریان دەکرد:

با قەدەغەکردن قەدەغە بکرێت!

با واقیعی بین: هەرچی شتێک نامومکینە داوای بکەن!

چیتر خۆتان نارەحەت مەکەن؛ خەڵک نارەحەت بکەن!

لە وڵاتی (دیکارت)دا حەماقەتی قومارباز‌ەکان فەرمانڕەوایە

حەزکردن لە واقیع باشە، بەڵام وەدیهێنانیان.. باشترە!

«پیرۆز» دوژمنی ئێمەیە

خەون واقیعە
خەیاڵ هێز پەیدا دەکا
بیر و باوەڕی خۆتان هەبێ!

ڕێزگرتنی لەخۆگەورەتر نەما چیتر بەدووایدا مەگەڕێ!

گەشبین بوونیش هەر گووە و بەکەڵک نایە، بجووڵێ! ژیان بگۆڕە!

ئەمە سەرەتایە، بەردەوام بن لە خەبات

شتێک لە دڵمایە بیڵێم، بەڵام نازانم چیە

دەرگای پەناگەکان بکەنەوە، دەرگای زیندان و قوتابخانەکانی دیکەش!

لەمەودووا تەنیا دوو جۆر پیاو هەیە: یان شۆڕشگێڕیت یانیش «گامێش». نە ئەم بیت و نە ئەو بیت، دەبیت بە «گامێشگێڕ».

گوو لە کۆمەڵگە دەکەم .. ئنجا دڵم خۆش دەبێ.

چیتر جەنتا و تەباشیر مەگرە دەست؛ دەسەڵات بگرە دەست!

مێشکتان و زنجیری پانتۆڵەکانتان.. بکەنەوە!

هێز لە لوولەی تفەنگدایە
دیوار گوێی هەیە، گوێی ئێوەش دیواری هەیە.

هێز لەناو شەقامەکاندایە.

ئێمە سەرقاڵی دنیایەکی تازە و ڕەسەنین، خەیاڵ خەریکە دەسەڵات دەگرێتە دەست.

شین هەر خۆڵەمێشی دەمێنێتەوە تا ئەوکاتەی دادەهێندرێتەوە

ئارەزووەکان وەدی دەهێنم، لەبەرئەوەی ئارەزووەکانم واقیعین و واقیعیەتیان هەیە

شۆڕش دەبێ لەناو ئینساندا هەڵبگیرسێ پێش ئەوەی لەناو شتەکاندا هەڵبگیرسێ

بەربەستەکان دەتوانن تەنیا ڕێگاکانمان لێ دابخەن، بەڵام دەنگەکانمان دەکەنەوە

ئەی ستالینییەکان، ئەوەتا ڕۆڵەکانتان لەگەڵ ئێمەن

ئارەزووەکانتان ئازاد بکەن

کەمێک بە گوێ نەکردن، دەبێتە زۆرێک دەسکەوت

چۆن بتوانین ئازادانە بیربکەینەوە لەژێر ڕۆشنایی ئەو کونجەدا

لەسەر شۆستەکاندا قەراغ دەریایەک ڕابخەن!

دڵی خۆت خۆش بکە: بێ ئەوەی گوێ بدەیتە بەربەستەکان!
بژی: بێ ئەوەی گوێ بدەیتە وەختە مردووەکان!

## کرۆنۆلۆژیای ئەو ڕاپەڕینە خوێندکاری و گەنجانەیە بەم شێوەیە بوو:

٢ی مایس ١٩٦٨

ژۆرژ پۆمپیدۆ سەفەر دەکات بەرەو ئێران؛ لە شاری نانتێر شەڕ و پێکدادان لەنێوان قوتابیان و پۆلیس دەست پیدەکات؛ دەوامی زانکۆ و خوێندن ڕادەوەستێ.

٣ی مایس

لەجیاتی دەوام، خوێندکاران لەناو زانکۆی سۆربۆندا کۆبوونەوە دەکەن و خۆپێشاندان سازدەکەن. گەورەترین خۆپیشاندانیش لە گەڕەکی لاتینی سازدەکرێت و ٦٠٠ قوتابی دەگیرێن. ڕۆژنامەکان دەست پێدەکەن هەست بە مەترسیی «کارەساتی خۆپێشاندانەکان» دەکەن.

٤ی مایس

دەوامی زانکۆکان و خوێندن وەستاوە. مانگرتنەکانی سەرتاپای قوتابیان دەست پێدەکەن.

٥ی مایس

چوار خۆپیشاندەر حوکم دەدرێن بە زندان.

٦ی مایس

شەڕ و پێکدادان لەنێوان قوتابیان و پۆلیس؛ زیاتر لە ٤٠٠ قوتابی دیکە دەگیرێن.

٨ی مایس

لەناو پەرلەماندا دەبێتە هەرا و دەنگۆ و گفتوگۆ.

٩ی مایس

زانکۆی سۆربۆن دادەخرێت؛ خوێندکارانیش دەیانەوێ سۆربۆن بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان.

١٠ی مایس

تا کاتژمێر ٣ی بەیانی هەرا و شەڕ و پێکدادان لەنێوان قوتابیان و پۆلیس لە گەڕەکی لاتینی بەردەوامە.

١١ی مایس

ئەنجوومەنی قوتابیان بانگەواز بڵاودەکەنەوە بۆ مانگرتنێکی سەرتاسەری لە هەموو فەرەنسا. ژۆرژ پۆمپیدۆ دەگەڕێتەوە و داوا دەکات کە لە ١٣ی مایسدا زانکۆی سۆربۆن بکرێتەوە.

١٣ی مارس

سۆربۆن دەکرێتەوە و دەکەوێتە دەست خوێندکارە خۆپیشاندەرەکان. پاریس شڵەژاوە. سەندیکاییەکانیش دەکەونە خۆپێشاندان. حکوومەت چەند ڕێکخراوێکی لاوان ، خوێندکارانەی قەدەغە کردووە.

١٥ی مایس

سەرۆکی فەرەنسا ژەنەڕال دی گۆڵ دەگاتە ڕۆمانیا؛ بەشێکی پاریس دەکەوێتە ژێر دەستی قوتابیان، پۆلیس و ئاسایش هەرەس دێنن.

١٦ی مایس

مانگرتن لە زۆربەی کارگە و کۆمپانیاکاندا دەست پێدەکات.

١٧ و ١٨ی مایس

حکوومەت تەواو شڵەژاو و دەستەپاچە بووە. خۆپیشاندان و مانگرتنێکی نیمچە سەرتاسەری هەموو پاریس و زۆربەی شارەکانی دیکەی گرتۆتەوە. دە ملیۆن کەس مانی گرتووە. ژەنەڕاڵ دی گۆڵ دەگەڕێتەوە پاریس.

٢٢ی مایس

کۆمیتەی نیشتیمانی بۆ پارێزگاریی کۆماری فەرەنسا دادەمەزرێت. سەندیکاییەکان (نەقابەکان) ئامادەیی خۆیان دەردەبڕن کە گفتوگۆ لەگەڵ حکوومەت بکەن: بۆ جێبەجێکردنی داخوازییەکانیان.

٢٤ی مایس

خۆپیشاندان و پێکدادان هەر بەردەوامە لە پاریس و زۆربەی شارەکانی دیکەی فەرەنسا. ژەنەڕاڵ دی گۆڵ لە تەلەفزیۆنەوە بۆ خەڵک دەدوێت و دان دەنێ بە نوشستیی حکوومەت و داوا دەکات ڕاپرسییەک سازبدرێت بۆئەوەی بزانن قوتابیان و میللەت چیان دەوێ؟!

٢٥ی مایس

دەستپێکردنی گفتوگۆ لەنێوان خۆپیشاندەران و حکوومەت.

٢٦و٢٧ی مایس

گفتوگۆی گەرم و بەردەوام لەنێوان حکوومەت و یاخیبووەکان (سەندیکاکان، خوێندکاران..)

٢٨ی مایس

کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسیی فراوان دەبەسترێت و لەوێدا فرانسوا میتران رادەگەیەنێت کە خۆی هەڵدەبژێرێت بۆ سەرەک کۆماری فەرەنسا لە داهاتوودا.

٣٠ی مایس

خۆپیشاندانێکی یەک ملیۆنی لە پاریس سازدەکرێت لە خۆشیی ئەو ریفۆرم و گۆڕانکارییانەی ژەنەراڵ دی گۆڵ لە وڵات سازی دەدات.

## رێگوزەریانە چەند قسەیەک لەسەر هەندێ لە دروشمەکانی راپەڕینە خوێندکارییەکەی مایسی ١٩٦٨:

١) قەدەغەکردن قەدەغەیە

پێش چەند مانگێک، رۆژنامەنووسی فەرەنسی، کریس کووچێرا، لە یانەی یەکیەتیی نووسەران لە هەولێر دانیشتبووین ماسیمان پێکەوە دەخوارد، پێی گوتم «تاقە دروشمێکی راپەڕینی خوێندکارانی فەرەنسای ١٩٦٨ کە تا ئێستاش هەر هێز و بڕستی مابێت، ئەو دروشمەیە کە داوا دەکات «قەدەغەکردن قەدەغە بکرێت».

گوتم: بۆچی؟

گوتی: چونکە ئەمە بۆتە سیمبولێک بۆ ئەو داخوازییانەی زۆربەیان شۆڕشگێڕانە بوون، تەنانەت بۆ ئەمڕۆش.

بێگومان ئاشکرایشە کە گەنج هەمیشە حەزی لە قەدەغەکراوەکانە: ئەگەر شتێکی لێ قەدەغە بکەیت، ئنجا زیاتر حەزی دەچێتێ. هەموو ئینسانێکیش هەر وایە. عارەب دەڵێن (كل ممنوع مرغوب).

ئەم دروشمە داخوازییەکە بۆ ئەهەڵگرتنی سانسۆر لەسەر هەرچی شتێکی

قەدەغە کرابوو، تەنانەت داوای ئەوەشیان دەکرد کە یاسای قەدەغەکردن خۆیشی قەدەغە بکرێت! ئەم دروشمە داخوازییێکە بۆ ئازادکردنێکی ڕەهای هەرچی شتێکی ڕەوا و بەسوود و جوانە لە کۆمەڵگای تابوودا.

گەنج و قوتابییانی یاخی ئەمە ستراتیژیان بوو: زۆریان داوا دەکرد بۆئەوەی مەکزیمەم وەدەست بهێنن!

## ٢) با واقیعی بین: هەرچی شتێک نامومکینە داوای بکەن!

وەدیهێنانی نامومکین کارێکی واقیعی نیە، بەڵام ئەوان زێدەڕۆیی دەکەن بۆئەوەی بیسەلمێنن کە دەیانەوێ خەباتێکی شێلگیرانە بکەن بۆ وەدیهێنانی خەونەکانیان. واقیعی بوون ئەوەیە کە تۆ نامومکینەکان بەڕاست بگەڕێنیت. ئەم دروشمە جەختی کردنە لەسەر ئەوەی کە نەسلی کۆن پێی وایە هەندێ شت نامومکینە، بەڵام نەسلی نوێ پێ دادەگرێت لەسەر ئەوەی کە هەر دەبێ بکرێ!

## ٣) خەون واقیعە

ئەمە لەوانەیە کاریگەرێتیی سوریالیستەکان بێت بەسەر ئەو قوتابییە سەرازایانەوە. چونکە تۆ لە خەوندا هەموو ویست و ئارەزووەکانت بەرجەستە دەبێت و وەدی دێت، ئەمانیش دەیانەوێ بڵێن کە پێویستە بەگوێی خەونەکانمان بکەین!

## ٤) خەیاڵ هێز پەیدا دەکا

ئۆسکار وایڵد دەڵێ (ئەوانەی خەیاڵیان نیە بێ ئەخلاقن). خەیاڵ دەتبا بەرەو خەونبینین و ئاوات و ویست. تۆ ئەگەر بتوانیت خەیاڵ بکەیت، ئەوا لەئەنجامدا ئەمە دەبێتە هێزێک بۆ تۆ: پەلت دەگرێ بەرەو وەدیهێنانی ئەو ئاوات و خەونانە.

## ٥) گەشبین بوونیش هەر گووە و بەگەڵک نایە، بجووڵێ! ژیان بگۆڕە!

قوتابیانی یاخی پێیان وایە کە (گەشبین بوون) وات لێدەکا چاوەڕێ بکەیت تا دۆخەکە بۆ خۆی دەگۆڕێت. ئەمەش هەڵەیە و دووات دەخات. کەواتە پێویستە لەم چاوەڕێکردنە ڕەپێ ببیتەوە و هەستیت بجووڵێیت: خۆت ژیانی خۆت بگۆڕیت.
دەڵێ: پیاوێک نوستبوو خەونی دەدیت. گوتیان هەڵی مەستێن بۆ خۆی خەون دەبینێ. بەڵام شاعیر هات گوتی: نەخێر، هەڵی بستێن بۆئەوەی خەونەکانی وەدی بێنێ.

## ٦) چیتر خۆتان ناڕەحەت مەکەن؛ خەڵک ناڕەحەت بکەن!

لە هەر گەنجێک بپرسی: «چیتە؟». دەڵێ: «بێ تاقەتم». قوتابیانی یاخی پێی دەڵێن: – مەڵێ بێ تاقەتم، هەستە ئەو بێ تاقەتییەی خۆت بکەرە جووڵەیەک، گۆرانییەک، نیگارێک، هەرایەک.. قەیناکە بام گەورەکانیش جاڕس بکا، بام پۆلیس و خەڵکیش بخاتە زەواقەوە!
ئەم دروشمە کاریگەرێتیی بیری ئانارشیستانەی (ئاژاوەخوازانەی) بەسەرەوەیە، بەڵام لەپێناو سەوزبوونی هێزی گەنج و تاکەکەس گوتراوە.

## ٧) گوو لە کۆمەڵگە دەکەم .. ئنجا دڵم خۆش دەبێ.

ئەم دروشمەش هەر کاریگەرێتیی بیری ئانارشیستانەی بەسەرەوەیە، بەڵام تێکدانی نەریتەکانی کۆمەڵگە وا لە کۆمەڵگە و حکوومەت دەکات کە ناچار بن بەشێوەیەکی تازە کۆمەڵگەکە دروست بکەنەوە.
کەواتە دڵخۆشبوونەکە (گوو لە کۆمەڵ کردن) تەنیا لەپێناو خۆبەتاڵکردنەوە (تەنفیس) نیە، بەڵکو ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتیانە و سیاسیانەیشی هەیە. وێرانکردنی نەریت و کۆت و پێوەندەکانە!

## ٨) چیتر جەنتا و تەباشیر مەگرە دەست؛ دەسەڵات بگرە دەست!

گاڵتە بەوە دەکات کە قوتابی تا هەتایە هەر دەیەوێ جانتا و تەباشیر بگرێتە دەست و تەنیا و تەنیا هەر ئەوە بزانێ کە گوێڕایەڵی مامۆستا و مودیر و یاساکان بێت. پێویستە بیر لەوە بکاتەوە کە کورسی و سیستەمە

کۆنەکەی ئەو پیرانە قەڵب بکاتەوە و خۆی سیستەمێکی نوێ بۆ زانکۆ و بۆ کۆمەڵگە دابڕێژێتەوە.

٩) شین هەر خۆڵەمێشی دەمێنێتەوە تا ئەوکاتەی دادەهێندرێتەوە.

ئەگەر داهێنان نەبێت، ئەگەر گۆڕانسازی لە کۆمەڵگە و لە ژیاندا نەکرێت، ئەو ڕەنگە جوانانەی ژیان و ئەو بەها بەرزە مرۆڤایەتییانە کە پێشێل کراون و لەلایەن نەسلە کۆنەکەوە و لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە ناشیرین کراون، هەر ناشیرین و کەم و خۆڵەمێشی دەمێننەوە. کەواتە پێویستە چاکسازی بکرێت و داهێنان بکرێت، کە سەرەتاکەی بە ڕاپەڕین و یاخیبوونی گەنجان و خوێندکاران دەست پێدەکات.

١٠) بیر و باوەڕی خۆتان هەبێ

ئەمڕۆ ئەگەر یاخیبوون نیە، مانای وایە بیرکردنەوە نیە. یاخیبوون لەوکاتەدا دەست پێدەکات کە من بیرم کردەوە. کەواتە دەبێ بیر بکەینەوە و ببینە خاوەن باوەڕی خۆمان نەک وەک پیرەکان و مامۆستاکان و دەسەڵاتداران و خەڵکی ئاسایی بیر بکەینەوە.

لە هەمان کاتدا ئەم دروشمە بیرێکی فەلسەفەی تاکخوازی (فەردانیەتی) تێدایە Individualisme کە گەنج و قوتابیان پێی کاریگەر بوون.

١١) ئارەزووەکان وەدی دەهێنم، لەبەرئەوەی ئارەزووەکانم واقیعین و واقیعیەتیان هەیە

ئەم دروشمە وەڵامدانەوەی ئەو پیر و دەسەڵاتدار و ئوستادانەیە کە پێیان وایە ئارەزووەکانی گەنج و قوتابیان چەند ئارەزوویەکی هەرزەکارانەن. جەختی کردنێکە لەسەر ئەوەی کە ئارەزووەکانیان واقیعی و ڕەوان.

١٢) «پیرۆز» دوژمنی ئێمەیە.

باوک و دەسەڵات و کەنیسە و پیرەکان کۆمەڵێک نەریت بە پیرۆز

دادەنێن و بێیان وایە ئەگەر گەنج لەو نەریتانە لابدەن ئەوا بەر نەفرەتی خوا وکۆمەڵگە دەکەون، دەمە لەکاتێدا ئەم سنووربەزاندنەی نەریت لەلایەن گەنج و قوتابییەوە دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە پلە و پایە و بەرژەوەندییەکانی دەسەڵات و پیرەکان. بۆیە گەنج و قوتابی جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە پێویستە دژی نەریت و دژی هەرچی پیرۆزێک بین!

## ١٣) ئەی ستالینییەکان، ئەوەتا ڕۆڵەکانتان لەگەڵ ئێمەن.

ڕاپەڕینی ١٩٦٨ی فەرەنسا، وەک چۆن لەژێر کاریگەرێتیی تاکخوازی و ئانارشیزمدا بوو، بە هەمان شێوەیەیش کەمێک لەژێر کاریگەرێتیی ماویزم و مارکسیزمیشدا بوو (هەر بۆیەش زوو کرێکارانیشیان لێ کۆبووەوە).

لەم دروشمەدا دەیانەوێ بە دنیا بڵێن: ئەوەتا مارکسییەکانی جاران و دکتاتۆرەکانی جارانیش لە فەلسەفەی خۆیان پەژیوان بوونەتەوە و هاتوونەتە ڕیزی ئێمە. ئەوەتا نەسلێکی نوی پەیدا بووە و بەپێچەوانەی ستالینی دکتاتۆری باوکی خۆی بیر دەکاتە و لەگەڵ ئازدی و مافەکانی گەنجانە!

## ١٤) مێشکتان و زنجیری پانتۆڵەکانتان.. بکەنەوە!

ڕاپەڕینی گەنج و قوتابیان گەلێک جار شێوازێکی قەشمەرجارانەشی بەکاردەهێنا. بۆ نموونە لێرەدا گاڵتە بەو گەنجانە دەکا کە لەژێر سانسۆری باوک و فەرمانەکانی حیزبدا دەژین و (مێشک داخراو) تەنیا دەزانن میز بکەن و گان بکەن و تەواو! گاڵتە بەو گەنجە گەوج و قوتابییە تەوەزەلانە دەکەن کەمێشکیان داخراوە و ژیانیان بریتیە تەنیا لە میزکردن و گان کردن و بەگوێکردنی مودیر و سەرۆک و دەسەڵاتدارەکان، داوایان لێدەکەن: مێشکتان بکەنەوە و کەمێک بیر بکەنەوە! بەسیەتی حەماقەت!

## ١٥) لەسەر شۆستەکاندا قەراغ دەریایەک ڕابخەن!

ئەم دروشمە دەعوەتنامەیەکە بۆ یاخیبوون و مانگرتن ، بۆئەوەی خەڵک برژێنە سەر شۆستەکان، بەڵام ئەم یاخیبوون و مانگرتنە جوانی و چێژێکی بێ هاوتای هەیە.

ئەم دروشمە نیشانەی ئەوەیە کە یاخیبوون و مانگرتنی گەنج و قوتابیان لە مانگرتن و یاخیبوونی خەڵکی دیکە ناچی: پڕە لە مۆسیقا و چێژ و جوانی و کامەرانی، وەک ئەوە وایە لە قەراغ دەریایەک بیت..

١٦) لە وڵاتی (دیکارت)دا حەماقەتی قوماربازەکان فەرمانڕەوایە.

دیکارت فەیلەسووفێکی گەورەی فەڕەنسایە و خەڵکی فێری یاخیبوون و ڕاپەڕین دەکرد لەبێناو بەختەوەی و جوانی و شکۆمەندی، کەچی نەسلی پیر و دەسەڵاتداری فەڕەنسا بەبێچەوانەی ئەمەوە هەموو بوونەتە قومارباز و قومار بە شەرەفی نەسلی نوێوە دەکەن!

١٧) دڵی خۆت خۆش بکە: بۆ ئەوەی گوێ بدەیتە بەربەستەکان! بژی: بۆ ئەوەی گوێ بدەیتە وەختە مردووەکان!

ئەم دروشمە گەنجانەیە، شتێک لە فەلسەفەی تاکخوازی و ئانارشیزم و هەروەها شتێک لە فەلسەفەی ئابیکۆریشی تێدایە: چێژوەرگرتن بۆ گوێدانە نەریت و کۆسپەکان.

شایانی باسە، ڕەخنەگرەکان پێیان وایە کە قوتابی و گەنج لەم دروشمەدا کاریگەر بوون بە کتێبی (شتەکان)ی جۆرج پێرێک کە ئەم فەلسەفە ئابیکۆری و تاکخوازییەی دەردەبڕی و داوای ئازادییەکی ڕەهای دەکرد لە ژیانی خێزانداری و تاکەکەسیدا.

# تۆ کاغەز بۆ من دەنووسیت پڕە لە مێژوو
# من کاغەز بۆ تۆ دەنووسم پڕە لە ئاینده

ئەم دێڕە شیعرەی ڕامیار مەحموود کە گەنجێکی تووڕەی ئەمڕۆیە و شیعرەکە لە هاوڵاتی (ژ ٢٢٨)دا بڵاوکراوەتەوە، جەوهەری ململانێی ئەم دوو نەسلە دوژمن بەیەکترەی پیر و گەنج ڕوون دەکاتەوە؛ جەوهەری حاڵی نەبوونیان لەیەکتری، جەوهەری ئەوەی کە لەکۆتاییدا نەسلی پیر ناچار ناچار ناچارە پێویست ببینێت کە سەر بۆ داخوازییەکانی نەسلی نوێ دابهێنێ: ئەگینا ڕاپەڕینێکی هەژەند لە داهاتوودا شۆستە و شەقام و پەرلەمان و زانکۆ و باڵاخانەی دەزگاکانمان وێران دەکا..

– لە کولتووری ڕۆژهەڵاتدا، وەک چۆن لە قورئانیشدا هاتووە، بۆ نموونە لە حەکایەتی ئیسماعیل و ئیبراهیم پێغەمبەردا: باوک بۆی هەیە کوڕەکەی خۆی، هەر کاتێک پێویست بێ، سەر ببڕێت و بیکاتە قوربانی!

– کوڕ دەبێ گوێڕایەڵی باوک بێت.

– ئەمە لە کولتووری ئیسلامەوە کەوتۆتە ناو کولتووری کوردیشەوە.

– بەڵێ. ئێمە بە منداڵەکانمان دەڵێین (خوا بەردی گەورە و بچووکی داناوە)، یان دەڵێین (ئەگەر باوک و دایک لێت ڕازی بێت خواش لێت ڕازی دەبێ). ئەمە بۆئەوەیە بیانبەستینەوە و لە قسەی ئێمە دەرنەچن.

– کەواتە بەپێی ئیسلام و نەریتی کورد: کوڕ کۆیلەی باوکی خۆیەتی.

– کوڕ دەبێ باوکی چی پێ بڵێت، ئاوها بکا.

– کەواتە، پلانێکی پێشوەخت داڕێژراوە و تەنانەت پیرۆزیش کراوە.. بەپێی ئەم نەریت و پلانە پێویستە هەمیشە نەسلی نوێ بدۆڕێت؛ پێویستە هەمیشە جیلی نوێ ملکەچ بکات بۆ جیلی کۆن.

– وایە.

– کەواتە، ئێمە، هەر بۆیەش، دونیای قەدیممان بەسەر دنیای ئەمڕۆدا هەر زاڵ دەمێنێتەوە.. بیری کۆنمان بەسەر بیری نوێدا هەر زاڵ دەمێنێتەوە. هەر بۆیەش ئەمڕۆمان تا هەتایە هەر لەژێر دەستی بڕیار و پێوەندگەکانی دوێنێدا دەمێنێتەوە.

- ڕاستە.

- هەر بۆیەش، (مامۆستا) سەبارەت بەوەی (گەورەیە) و ئیمازی باوکی تێدایە، «پیرۆز» کراوە و دەبێ گوێڕایەڵی بین!

- وایە.

- بواری ئەوە نادەینە کوڕ کە شتی نوێ و کاری هاوچەرخانە و ڕەفتاری ئەمرۆییانەی هەبێت.

- وایە.

- ئەمە لەکاتێکدا لە کولتووری ڕۆژئاوادا، بەتایبەتیش لە مایسی ١٩٦٨ بەملاوە، واتە لە ڕاپەڕینی خوێندکارانەوە، خێزان بۆتە جێگەیەکی گفتوگۆ لەپێناو ڕێککەوتن، کە کوڕ (بەشێوەیەکی گشتی منداڵ) تێیدا وەک ئینسانێک گوێی لێ ڕادەگیرێ، نەک ئەمری بەسەردابکرێ.

- چۆن؟

- منداڵ (ئەگەر کوڕ ئەگەر کچ ) هەرگیز ئەمری بەسەردا ناکرێ، بەڵکو گفتوگۆی لەگەڵ دەکرێ؛ گوێی لێ ڕادەگرن.

- چیتر؟

- باوک زوڵم لە کوڕی خۆی ناکا، بەڵام لێرە - لە ڕۆژهەڵات - باوک دەسەڵاتێکی ئەرژەنگ و دیکتاتۆریانەی پیسی بەسەر کوڕەوە هەیە.

- چیی تر؟

- لە کولتووری ئەورووپیدا، ئەگەر کوڕ ئەگەر کچ، کاتێ دەگاتە تەمەنی ١٧-١٨ ساڵ، ئیتر لە هەڵبژاردن و بڕیارەکانی خۆیدا ئازادە. کەچی لێرە - لە ڕۆژهەڵات - کوڕ پابەندی گیرفان و عەقڵ و بڕیار و هەڵبژاردنەکانی باوکیەتی. (خۆش لەوەدایە، گەلێک لەو ڕووناکبیرانەی تەمەنیان لەنێوان ٢٠- ٣٠ ساڵیدایە، وتار دژی باوکسالاری بڵاودەکەنەوە: کەچی لە ماڵەوە جەسارەت ناکەن جگەرەیەکیش لە حزووری باوکیان بکێشن!).

- هۆی ئەم مەرگەساتە، تەنێ بۆ زاڵم بوونی باوکی ڕۆژهەڵاتی ناگەڕێتەوە. هۆیەکەی تەنیا ئەوە نیە کە باوکی ڕۆژهەڵاتی دکتاتۆرە: بەڵکو هۆکارەکە - بە بۆچوونی من - دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کوڕ خۆیشی - لە ڕۆژهەڵاتدا- تەمبەڵ و بێ جەسارەتە، متمانە ناکاتە سەر هێزی خۆی.

مەسەلەن، کوڕ، زۆر جار، تەنانەت دووای تەواوکردنی زانکۆش، دەست و پێ سپی، باوک ژنی بۆ دەهێنێ! کەواتە گەنجی کورد خۆی بێ جەسارەت و دەستوپێ سپییە. بەڵێ، توانای ئەوەی نیە بزانێت بتوانێت یاخی ببێت و گۆڕانکارییەکان بکات.

- لەوانەیە ئاخر لەمەشدا دیسان خەتای نەسلی کۆن (باوکەکان) بێت کە کوڕەکان و نەسلی نوێیان وا ڕاهێناوە (لەڕاستیشدا تەمبێیان کردوون) کە لە سەربەستیی خۆیان بترسن، نەوێرن تەنانەت بیریش لە خۆشترکردنی ژیانی خۆیان بکەنەوە. لەلایەکی دیکەشەوە خەتای حکوومەتە.

- بەڵام من گەشبینم.

- بۆچی؟

- چونکە هاوزەمانی ئەم نەسلە کۆنە دکتاتۆرە، نەسلێکی نوێ و عەقڵێکی نوێی ئەوتۆش تازە خەریکە دەرکەوتووە کە بای ئەوەندەی لەدەست دێتەدەر کە بتوانێ ئومێدی داهاتوو بێت.

- ئەو تۆزە عەقڵە نوێیەی هەیە و دەرکەوتووە، بەڕاستی، - دەبێ دانی پێدا بنرێت- بەری داری ئەم چەند ساڵە ئازادییەی دووای ڕاپەڕینە.

- چۆن؟

- گەنجی ئەمڕۆ، لەو وەختەوەی لە ڕژێمی صەدام دابڕاون و لەژێر سێبەری نیمچە ئازادییەکەی حکوومەتی هەرێمدا دەژی، توانیویەتی تا ڕادەیەک جیاواز بژیت و شتی تازە بهێنێتە ناو ژیان و کولتووری خۆیەوە. بەکورتی: ئەم چەند ساڵە ئازادییەی دووای ڕاپەڕین جیلێکی نوێی کارا و نەسلێکی ڕاچەنیوی ئەکتیڤ و جیاوازی دروست کردووە کە دەتوانێ - هیچ نەبێ هەندێ جار ئازادانە ڕەخنە بگرێت.

- ڕاستە، لە سەردەمی دەسەڵاتی بەعسدا ئەمە بە هیچ شێوەیەک مومکین نەبوو؛ بەڵام من وای بۆ دەچم کە ئێستاش هەر ئەم بزاڤە گەنجانە و خوێندکارییە بزاڤێکی تەنیا ئەدەبیاتی و ڕۆژنانەگەرییانەیە. ئەمە خاڵێکی لاوازی بزاڤەکەیە.

- بزاڤێکی تەنیا ئەدەبیاتی و ڕۆژنامەگەرییانەیە؟ مەبەستت چیە؟

- گوتم بزاڤی گەنج و قوتابیان تا ئەمڕۆش هەر تەنیا بزاڤێکی ئەدەبیاتی

و ڕۆژنامەگەرییانەیە، واتە نەگەیشتۆتە ئاستێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و توندوتیژی ئەوتۆ کە حکوومەت بترسێنێ! ئەمە لەکاتێکدا بۆ نموونە لە کۆریای باشوور بزاڤی گەنج و خوێندکاران بووە بزاڤێکی چەکداری و پێشمەرگانە.

- لەگەڵ ڕاپەڕین، واتە لە ١٩٩١ بەملاوە، کۆمەڵێک چەمک - لە هەموو بوارەکاندا - هاتوونەتە ناو مەیدانی کار و بیرکردنەوە، کە پێشتر بە هیچ شێوەیەک بوونیان نەبوو یان پراتیک نەدەکران: مافی مرۆڤ، مافی منداڵ، مافی ئافرەت و ئازادییەکانی، کۆمەڵگەی مەدەنی، دیموکراسی، هەڵبژاردن و خۆهەڵبژاردن، سیستەمی پەرلەمانتاری و حکوومەتی دەستووری، ئازادیی ڕادەربڕین، ئازادیی ڕۆژنامەنووسی و چاپەمەنی، سیستەمی فرە حزبی.. دەیان دیاردەی دیکە هەموویان لە سەردەمی صەدامدا قەدەغە بوون یان تەنێ کلێشە بوون؛ بەڵام ئەمڕۆ لە کوردستان ئەم چەمکانە هەموویان وردە وردە بەڕاستی پراتیک دەکرێن و کەوتوونەتە ناو ژیان و کارەوە. هەر بۆیەش دژایەتییەکان و ناکۆکییەکان لە کوردستاندا - لەچاو بەغدا و باشوور - بەرهەمیان هەیە و کاردانەوە و ئەنجامی باشتریان هەیە.

- بەڵام ئەمە دووفاقیی (ئیزدواجیەتی) لەناو دەروونی خەڵکدا و بەتایبەتیش لەلای گەنج و قوتابییاندا دروست کردووە.

- چۆن؟

- کولتوورێک خەریکە کۆتایی دێت، بەڵام هیچ کولتوورێکی نوێ لەجێگەی ئەودا هێشتا دروست نەبۆتەوە. ئەمە خەتەرناکە. ئەم دوو کولتورییە زۆر ترسناکە.

- مەبەستت چیە؟

- بۆ نموونە..

- بەڵێ؟

- ئەوا پازدە ساڵە ئێمە باسی ئازادیی ئافرەت دەکەین، کەچی تا ئێستا بار و دۆخێکی ئاوها لەلایەن حکوومەت و دەزگا بەرپرسەکانەوە بۆ ئافرەت دروست نەکراوە کە بتوانێ مومارەسەی ئەو ئازادییەی تێدا بکات..

مەسەلەن.. تۆ کە دەتەوێ ئافرەت بەئازادییەوە بێتە دەرەوە، ئەدی نابێ لەسەرەتادا ئەمن و ئاسایشی ئەو ئافرەتە زامن بکەیت؟ ئەدی نابێ لەسەرەتادا ئەو قانوونە بگۆڕیت کە دەڵێ (نابێ کچ لەدووای تاریکی داهاتن و ڕۆژئاوابوونەوە بگەڕێتەوە بەشە ناوخۆییەکان)؟ نموونەیەکی تر..

- بەڵێ؟

- ئەوا پازدە ساڵە ئێمە باسی ئازادیی تاکەکەس دەکەین، یان باسی پێویستیی نەمانی دەسەڵاتی باوکسالاری دەکەین، باشە ئەدی نابێ لەسەرەتادا چەند قانوونێک لە پەرلەمان پێشنیار بکرێت و ببێتە دەستوور کە زەمینە بۆ ئەو سەربەخۆبوونەی کوڕ خۆش بکات؟

- یەعنی چۆن؟

- بۆ نموونە بۆئەوەی قوتابی بتوانێت شەخسیەتی خۆی هەبێت و بێ منەتی باوک خوێندنی خۆی تەواو بکات؟ بۆئەوەی خوێندکار بتوانێ ئەگەر حەزی کرد سەفەرێک بکات؟ بەشێوەیەکی گشتی: بۆئەوەی قوتابی چیتر چاوی لەدەستی باوکی خۆی نەبێت؟ بۆئەوەی قوتابی بتوانێ کاتێ ویستی کتێب و سەرچاوە و پێویستییەکانی دیکەی خوێندن بکڕێت یان کاتێ ویستی سەفەرێک بکات و هەندێک دنیا ببینێ، یان کاتێ ویستی خۆشەویستەکەی خۆی دەعوەت بکات... ئەم داخوازییە، ئەم کێشەیە.. چۆن چارەسەر دەکرێت؟! چۆن ئیعتیباری قوتابی و ئازادییەکانی و شەخسیەتی سەربەخۆی خۆی، لە باوک بسەنرێتەوە؟

- ئەورووپا توانیویەتی ئەم کێشەیە چارەسەر بکات.

- چۆن؟

- قانوونێکی دەرکردووە بەپێ ئەو قانوونە: گەنج لە ماوەی ژیانی زانکۆییدا مافی ئەوەی هەیە کە قەرز لە حکوومەت وەربگرێت. لە هەمان کاتیشدا مانگانە دەرماڵەیەکی هێندە زۆر وەردەگرێ کە منەتی بە باوک نامێنێت و چاوی لە باخەڵی باوک نابێت. ئەم قانوونە وادەکات کە کوڕ بەتەواوەتی ئازاد بێت و شەخسیەتێکی «خۆبەکەم زان» و لاوازی نەبێت: هەر کاتێک بیەوێت، بتوانێ سەفەربکات و دەعوەتی خۆشەویستەکەی بکات و کتێب و پێداویستییەکانی دیکەی بکڕێت و بەکورتی: ئاسوودە و

ئازاد بژیت..

- وایە.

- کەواتە سیاسەتی ئابووریی ئێمە لەهەمبەر گەنج و قوتابییانەوە سیاسەتێکی ئابووریی هەڵەیە.

- باشە بۆچی تاکو ئێستا ئەندام پەرلەمانێک ئەم داخوازی و پێویستییەی لەناو پەرلەمانی کوردستاندا مەترەح نەکردووە؟ بۆچی هیچ راوێژکارێکی ئەنجوومەنی وەزیران ئەمەی بۆ سەرۆکایەتیی حکوومەتی هەرێمی کوردستان پێشنیار نەکردووە؟ بۆچی مامۆستایانی زانکۆ و وەزیر و سەرۆک زانکۆ و عەمید و رۆشنبیر و مودیر و مەلا و مامۆستاکان، تا ئێستا ئەم مەسەلە گرنگانەیان نەورووژاندووە؟

- دەزانی بۆ:؟

- بۆ؟

- چونکە ئەندام پەرلەمان و کاوێژکار و وەزیر و سەرۆک زانکۆ و عەمید و مودیر و مەلا و مامۆستاکان،هەموویان بۆ خۆیان پیرن، بۆ خۆیان باوکن، لە بەرژەوەندیی ئەواندا نیە کە کوڕ، قوتابی و گەنج، ژیانیان بەرەو باشتر و باشتر بکۆڕێت. دەیانەوێ خوێندکار و گەنج (کوڕەکانیان) تا هەتایە، ژێر دەست، چاویان لەدەستی لەخۆگەورەتر، لەژێر فەرمان و ستەمی خۆیاندا بمێنێتەوە. ئەمەیە ململانێی نەسلەکان.

- کەواتە، راستە: حکوومەت خۆیشی بەرپرسە لەم پاشکەوتن و کۆیلەمانەوەیەی نەسلی نوێدا.

- تەنانەت من حکوومەت بە بەرپرسی یەکەم دادەنێم.

- راست دەکەی: کوڕ، زۆر جاران، تەنانەت دووای تەواوکردنی زانکۆش، دەست و پێ سپی، باوک ژنی بۆ دەهێنێ! بەڵام تۆ بۆچی حکوومەت بە بەرپرسی یەکەم دادەنێیت؟

- چونکە پێویست وایە حکوومەت خۆی ئەم قانوونە دەربکات کە باسم کرد؟ لە دەسەڵاتداریتیی سەرۆک حکوومەتدا هەیە کە قانوونێکی ئاوها دەربکات.

- ئەدی نابێ پەرلەمان خۆی پێشنیاری بکات و بریاری لەسەر

دەربكات؟

- پەرلەمـان تەنیـا مـیـر و مـەلا و مـودیر و مـامـۆسـتـا و باوک و پیـر و پرۆفـیـسـۆری تێـدایە؛ ئەمـانەش خـۆیان - وەک گـوتم: دوژمنی تەڵەبە و گـەنجن! پەرلەمـانی کـوردسـتـان تا ئەمڕۆش یەک قـوتابی یان یەک گـەنجی تێـدا نەبووە؛ تا ئێـسـتـا تەنانەت نوێنەری گـەنج و خـوێندکـارانیـش لە پەرلەمانی کوردستاندا وجوودیان نەبووە و نیە.

- کەواتە ئەمەیە هۆکاری ئەوەی کە ئێمە قانوونەکانمان هەموویان لەپێناو ژیان و بەرژەوندیی پیر و پرۆفـیـسـۆر و میر و مەلا و مودیرەکانە و بەس؟! ئەمـەیە هۆکـاری ئەوەی کە ئێـمـە کـۆمەڵگەیەکی تا سـەر ئێـسـقـان پیـرین، کەنەفتین.

- لە هەموو ئەمانە پیستر دەزانی چیە؟

- لە کوردستـاندا کراوەتە قانوون: هەر کەسێـک بیەوێت خۆی هەڵبژێرێت بۆئەوەی ببێـتـە ئەندام پەرلەمـان، پێـویـسـتـە تەمـەنی لەسـەرووی ( ٣٠ ) ساڵییەوە بێت! دەزانی؟

- کێ ئەم قانوونەی داناوە؟

- پیر و پرۆفیسۆر و میر و مەلا و مامۆستاکانی «قانوون»! حکوومەت.

- دەزانی بۆچی ئەمەیان کردۆتە قانوون؟ دەزانی بۆچی گەنجێک بۆی نیە ببێـتـە ئەندام پەرلەمـان؟! بە هەمـوو شێـوەیەک (بە قـانـوونیش !) هەمـوو ڕێگەیەکـیــان لە پێـشکەوتنی قـوتابی و گـەنج گـرتـووە؟ دەزانی بـۆچی گەنجێکی ( ٣٠ ) ساڵە بۆی نیە ببێتە ئەندام پەرلەمان؟!

- بۆئەوەی گــەنج نـەتوانێ دەنگی نارەزایی بەرز بکـاتەوە، بۆئەوەی نەتوانێ پێشـنیـاری هیچ قـانوونێکی ئاوها بـکات کە باسـمـان کـرد و لە بەرژەوەندیی گەنج و خوێندکاراندایە.

- ئەمە لە حاڵەتێکدا زۆربەی کۆمەڵگە هەمیشە گەنجن!

- لەوەش نایەکسـانتـر: هەر ئەندام پەرلەمـانێکی پیر لەنـاو پەرلەمـانی کـوردسـتـاندا هیچ سنوورێکی بۆ دانەنراوە: تەمەنی پیرێـک لە هەشتـایشی تێپەڕاندبێ قانوون بۆی نیە هیچی پێ بڵێ!

- ئەمە بەتەواوەتی ئەوە دەردەخات کە قانوونیان بەشێوەیەکی وا داناوە کە کۆمەڵگە و حکوومەت دژی گەنج بێت و هاوزەوقی پیر بێت!

- دژی گەنجبوونەوە بێت و لەگەڵ مانەوەی نەریتی پیران و عەقڵی پیران بێت!

- بەڕاستی، ئەو پیرە دەسەڵاتدارانە هەر گەمەیەکی کردبێتیان، لە بردنەوە دڵنیا بوونە: باش توانیویانە نەسلی نوی ببەستنەوە. بە «قانوون»!

- باشە چارەسەری ئەمە چیە؟

- پیرەکان هیچ ریفۆرمێک ناکەن، گەنج و قوتابییەکانیش «لەبەر ئەمنی قەومیی کوردستان» هیچ جووڵەیەک ناکەن.. چارەسەر چیە؟

- بۆئەوەی یاخیبوونێک سەرهەڵبدات، پێویستە تاکەکان هەست بە بەرژەوەندییە هاوبەشەکان بکەن.

- بەڵام هەستی ئەم بەرژەوەندییە هاوبەشە دروست بووە، ماوەیەکی زۆرە.

- بەپێچەوانەی کوردستان، هەر ئەمساڵ، لە ئەڵمانیا قوتابییەکی تەمەن ١٩ ساڵی بۆتە ئەندام پەرلەمان. لە فەرەنساش و زۆربەی وڵاتانی دیموکرات: هەر خوێندکار و گەنجێکی (٢١) ساڵەیی بۆی هەیە ببیتە ئەندام پەرلەمان.

- باشە چارەسەر چیە؟

- من بێم گوتی: بزاڤی خوێندکاری و گەنجانەی ئێمە لە کوردستاندا تا ئیستا بزاڤێکی تەنیا ئەدەبیاتی ورۆژنامەنووسییە، نەبۆتە قورسایی و هێز و مەترسییەک بۆ سەر حکوومەت و پەرلەمانە پیرەکەمان.

- کەواتە، گەنج و قوتابیان پێویستە فشار بخەنە سەر پەرلەمان بۆ مەسەلەی گۆڕینی ئەو قانوونەی پەیوەندیی بە تەمەنی (٣٠) ساڵەوە هەیە. هەڵبەتا قوتابی و گەنج داخوازی و گرفت و خۆزگەی زۆری دیکەیان هەن.

- کەواتە، نەک فشار، پێویست وایە ئەو فشارە بگاتە ئاستی یاخیبوون، بگاتە ئاستی ڕاپەڕینێکی گەنجانە و خوێندکارانەی سەرتاسەری..

# فیدای جوتیارتان بێ حاتەمی تەی
# بەقوربانی سەپانتان ئالی بەرمەک

حاجی

لە فەسڵێکی پێشوودا گوتمان: ڕاپەڕینی ۱۹۹۱ و ئەم پازدە ساڵ ئازادییەی هەمانە، وایکردووە دۆخێکی دووفاقی (ئیزدواجیەت) لەناو دەروونی خەڵک و ڕۆشنبیراندا بەتایبەتیش لەلای گەنج و قوتابیاندا دروست ببێت. چونکە لەم ماوەیەدا کولتوورێک خەریکە کۆتایی دێت، بەڵام هیچ کولتوورێکی نوێ لەجێگەی ئەودا دروست نەبۆتەوە.

ئاسەواری بەعس هێشتا هەر بنبڕ نەبووە. ئەم ئاسەوارە لەناو میکانیزمی چالاکییەکان و زانکۆکان و سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵات و سیاسەتی حکوومەتیشدا هەستی پێدەکرێت. ئەمەش میللەتەکەی تووشی دووانەیی بیرکردنەوە و دووفاقێتی کردووە لە ڕەفتاردا: لەلایەکەوە ئازادن، لەلایەکی دیکەوە هێشتا هەر ژێردەستەن.



ئەم دۆخە دوو فاقییە، چەند زیانبەخشە و گرفتی تازەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، ئەوەندەش نیشانەی ئەوەیە کە زۆرانبازییەکەی نێوان نەسلی کۆن و نوێ تیژتر دەکاتەوە. من نالێم (ئەم دۆخە دوو فاقییە) سوودبەخشە، بەڵام پێویستە توێژە یاخی و چالاکەکانی کۆمەڵ (ڕۆشنبیران، قوتابیان، نووسەرە گەنجەکان..) سوودی لێ ببینن، واتە ئەو توخمانە بەهێزتر بکەن و باشتریان بەگەڕ بخەن کە دەبنە هۆی بەهێزکردنی نەسلی نوێ و نوێگەرێتییەکەیان.

حەزدەکەم چەندنموونەیەک بۆ ئەو دۆخە دوو فاقییە (ئیزدیواجیەتە) بهێنمەوە کە لە کوردستاندا هەیە:

١) نموونەیەک لەبارەی ئیزدیواجیەتی بەڕێوەبردنی وڵات:

لە بەرواری ٢٠٠٢/١٢/٣١ نزیکەی چوار صەد قوتابیی زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر خۆپیشاندانێکیان سازکردبوو لەپێناو وەدیهێنانی پازدە ئامانجی گرنگی ژیانی خوێندکارییان. کاتێ گەیشتبوونە بەردەم سەرۆکایەتیی زانکۆ، سەرۆکایەتیی زانکۆ لەجیاتی ئەوەی گوێیان لێ ڕابگرێت و بەتەنگ داخوازییەکانییەوە بچێت: پەرتەوازەی پێ کردبوون و پۆلیسی تێ بەردابوون. هۆی ئەمە بێگومان ئەوەیە کە سەرۆکایەتیی زانکۆ سەرۆکایەتییەکی پیرە و بە عەقڵیەتێکی پەرپووت و کۆنی دکتاتۆریانەی ساڵانی بەعس بەڕێوە دەچێت! کەچی لە هەمان ڕۆژدا (لە هەمان ڕۆژی خۆپیشاندانەکەدا) لە هەمان ئەوکاتەی کە سەرۆکایەتیی دکتاتۆری زانکۆ پۆلیسی لە داخوازییەکانی قوتابیان بەردابوو؛ سەرۆکی حکوومەتی ئەم هەرێمە، نێچیرڤان بارزانی، کە پیاوێکی گەنج و کراوە و دیموکراتە و ڕۆشنبیرییەکی هاوچەرخانەی هەیە، خاکەڕایانە چووبوو لەسەر ئەنتەرنێت دانیشتبوو، وەڵامی هەزاران گازاندە و ڕەخنەی کوردەکانی ئەورووپای دەدایەوە لەبارەی حکوومەتەکەی!

ئەمە چ پێچەوانەیی و دوو فاقی و سەمەرەیەکە لەم وڵاتەدا؟ ئەمە چۆن لێک دەرێتەوە: سەرۆک حکوومەت گوێ لە ڕەخنەی نەسلی نوێ بگرێت؛ کەچی سەرۆکایەتیی زانکۆ پۆلیس بەربداتە گیانی خوێندکارانەوە؟

وەڵامەکەی ئاشکرایە: سەرۆکایەتیی زانکۆ خاوەن عەقڵییەتێکی کۆن و پیری بەعسییانەی سەردەمی صەدامە، بەڵام سەرۆک حکوومەتەکە پیاوێکی گەنجی سەر بە هەمان جیلی تازەی دووای ڕاپەڕینە!

٢) دوو فاقێتی و چەوت و چەوێڵیی سیاسەتی ئابووریمان

ئەم دوو حزبە فەرمانڕەوایەی پارتی و یەکیەتی، نەک هەر تەنیا نەیانتوانیوە ئاسەوارە کۆنەکانی ڕژێمی بەغدا لەسەر خۆیان بسڕنەوە و بێن سیستەمێکی نوێ بۆ پێکهاتەی وەزارەت و دەزگا و زانکۆ و بەڕێوەبەرایەتییەکەیان دابمەزرێنن، بەڵکو بە هێنانە ناوەوەی دوو دەست و سیستەمی بێگانەی دیکەیش (ئێران) و (تورکیا) بۆ ناو کوردستان، سەریان لە میللەتەکەی خۆیان و تەنانەت سەریان لە رووناکبیر و هونەرمەندەکانیشیان شێواندووە! بۆ نموونە، هەولێر و سلێمانی، هەر لایەکیان بە جودا، بوونەتە بازاڕی ساغکردنەوەی بەرهەم و کەرەستە و کولتووری وڵاتێکی بێگانەی جیا. ناوچەکانی سلێمانی بوونەتە بازاڕێک بۆ قازانجی ئێران: پڕن لە کەلوپەل و خواردن و هونەر و کولتوور و کەرەستەی ئێرانی؛ ناوچەکانی هەولێر و دهۆکیش بوونەتە بازاڕێک بۆ قازانجی تورکیا، پڕن لە کەلوپەل و خواردن و هونەر و کولتوور و کەرەستەی تورکیا. ئەمە چونکە هەر حیزبێک بەجیا لەلای خۆیەوە لەسەر قازانجی (باج) و گومرگی سنووری ئەو دوو دەوڵەتەی دراوسێ دەژیت.

دوو فاقییەکە لەوەدایە (قوتابی و گەنج دەپرسن): ئەدی قازانجی نەتەوەیی؟ ئەدی بەرهەمهێنانی کوردستانی؟ چما «سەربەخۆیی کوردستان» و داواکردنی دامەزراندنی «دەوڵەتی کوردی» هەر وا بە هەوەنتە و تەنیا بە شیعارات دەکرێ؟

زۆر سەیرە: شیعاراتی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی و ریفیراندۆمی سەربەخۆیی کوردستان بەرزدەکەینەوە، کەچی لەمالاشەوە ماڵی وەزیر و مودیر و مەلا و میر و مامۆستا و سەرۆک زانکۆکانمان پڕن لە «ئاوی حەیات»ی تورکی و «هەنگوینی سعوودی» و «ماستی ئێرانی»..! ئەمە لەکاتێکدا باشترین و خۆشترین هەنگوین و ماست و ئاو لە کوردستاندا هەیە. شاعیری ناودارمان، حەمدی، نیو سەدە بەر لە ئەمڕۆ گوتوویەتی:

ئەم ئاو و ئەرزەی ئێمە هەمانە زەرع کرێ
دەوڵەت دەبێ بە کۆڵکەش و شا بە سەپانمان

ئەم سیاسەتە ئابوورییە چەوتە بەرهەمی بیری پیری ئەندام پەرلەمان و حکوومەتەکەیە، بەڵام لەبەرامبەر ئەمەدا و بەپێچەوانەی ئەمە: یەکێک لە دروشمەکانی ئەو گەنجانەی لیستێکی گەنجانە و خوێندکارانەیان دامەزراندبوو بۆ خۆهەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ساڵی (٢٠٠٥) ئەوە بوو داوایان دەکرد بایەخ بدرێتە بووژاندنەوەی بەرهەمە نەتەوەییەکان!

بەم شێوەیە، دوو فاقی و دوو جۆر بیرکردنەوەیی، لە کوردستانی ئەمڕۆدا، بۆتە شەڕێکی توند لەنێوان جیلی کۆن و نوێدا. ڕاستییەکەیشی، ئەم توێژە یاخی و ڕاپەڕیوەی قوتابیان و گەنجەکان، ئەمەتا دیارە: لە جیلە کۆن و پیرەکەی ناو پەرلەمان و ناو وەزارەت و دامودەزگاکان ناسیوونالیست تر و نەتەوەپەروەرترن؛ چونکە ئەم گەنج و قوتابییە زیرەکانە دەزانن، باش دەزانن کە «دەوڵەتی کوردی» و سەربەخۆیی کوردستان بە فشەی ئیعلامی و دروشمی حزبایەتی دروست نابێت، بەڵکو بەوە دروست دەبێت کە کورد سەرمایە و پارە و پووڵێکی مەزن کۆبکاتەوە و شەخسیەتێکی مەزنی دارایی و هێزێکی سەرمایەداریی گەورەی هەبێت بۆئەوەی بتوانێ بڵێت «هەم».

کەواتە، کورد دەبێ بتوانێ بڵێت «من هێزێکی دارایی و مەزنی ئابووریم هەیە»، ئنجا دەتوانێ بڵێت «کەواتە، من هەم». کورد دەبێ شەخسەتێکی زۆر بەهێزی سەرمایەداری بۆ خۆی دروست بکات، ئنجا دەتوانێ بە دنیا و بە دراوسێکانی بڵێت «من هەم».

دروستبوونی ئەم شەخسیەتە مەزنە دارایی و هێزە سەرمایەدارییە کوردییە گەورەیەش، بێگومان، بە بووژاندنەوەی بەرهەمهێنانی ناوخۆ و کشتوکاڵ و پیشەسازییە نەتەوەییەکان دێتە دی، وەک حاجی کۆیی دەڵێ:

بەراو و ئەرزی ئێوە کیمیایە
دوڕ و گەوهەر گەر مازووی چیایە
مەعادین خاتری تۆ بێ لەگەڵ کان
گەنمتان زێرە حەتتا زیوە زیوان

یان بۆ نموونە وەک ئەحمەد موختاربەگی جاف دەڵێ (لەڕێگەی توورێزم و گەشتوگوزارەوە):

کێو و کەژ گشتی دەبێتە باخ و قەسری گەوهەرین
بۆ تەماشا دەستە دەستە دێن لە ئینگلستانەوە

نەسلی نوێ، گەنج و قوتابیان، شەڕ لەپێناو ئەم ئامانجە جوانانە دەکەن و دەپرسن: پەرلەمانی پیری کوردستان و ئەم دوو حزبە فەرمانڕەوایە، ئاخۆ کەی بیر لەوە دەکەنەوە شیر و ماست و تووتن و کەرەستە و سامانە نەتەوەییەکانی خۆیان، لە جیاتی کەل و پەل و کەرەستە بیانییەکانی دراوسێ بخەنە ناو بازاڕەوە؟

ئایا بەجێگەیاندنی ئەم پڕۆژەیە، ئەرکی پەرلەمان و حکومەت و حزبەکان نیە؟ تۆ بڵێی پەرلەمان و ئەم دوو حزبە و ئەم حکوومەتە کوردییە نەزانن کە پابەندبوونی خواستەمەندانەی ئابووری و بازرگانیی کوردستان بە تورکیا و ئێرانەوە، هەمان واتای کۆیلایەتیی کوردستان و بندەستبوونی کورد دەگەیەنێت؟! بۆچی نایانەوێ لەم بندەستی و پابەندبوونە ئابووریە ڕزگار بن؟ خۆ ئەمەیان (وەک مەسەلەی دەوڵەتە کوردییەکە) مەسەلەیەکی سیاسەتی نێودەوڵەتی نیە و بڕیاری نێودەوڵەتی و بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکانی ناوێ!

بەم شێوە، نەسلی پیری پەرلەمان و جیلی کۆنی حیزب و داموەزگاکان، بەتایبەتی بەهاران (بەتایبەتیش لە مانگی مارس و ئەپریلدا: ئەوکاتانەی خوێندکاران سەرقاڵی خوێندن و دەوامن) بەردەوام مەژغوولی لێدانەوەی قەوانە کۆنە گریاناوییەکانی مێژووی خوێناویی کوردن و لەم وەرزەدا دێن دەیان جار «یادە نەتەوەییە شکۆمەندەکان» یاد دەکەنەوە؛ بەپێچەوانەی ئەمانەوە، قوتابیان و گەنج و جیلی نوێش فشەیان بە عەقڵی ئەم ئیعلامە پیر و درۆزن و ئەم پڕۆپاگاندەیە بێهوودەیەدا دێتەوە و حەزدەکەن حکوومەت و حیزب و پەرلەمان چیتر ئەوەندە بەسەر مێژووی خۆیدا نەگریت و بێت کەمێک بکەوێتە بیری بونیادنانەوەی خۆی و داهاتووی..

٣) پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیی ئەمڕۆی کوردستان جۆراوجۆرێتییەکی وای لە فۆرمی خەباتی سیاسی و حیزبیدا هەیە کە بە قەد جۆراوجۆرێتیی فۆرمە کۆمەڵگەراییەکان و عەشیرەتگەراییەکان جۆراوجۆرن. ئەم دیاردەیە، بێگومان دیارە کاریگەرێتییەکی باری خراپانەی هەیە بەسەر یەکڕیزبوونی گەنجان و یەکگرتنی قوتابیانەوە.

ئەم وڵاتە پڕە لە حاڵەتی ناکۆک ودژبەیەکتر: وەزیری وەزارەتی مافی مرۆڤ گەنجێکی نوێخوازی لە ئەورووپا گەڕاوەیە، کەچی سەرۆکی فلان حزب سەرۆک عەشیرەتێکی ئەوتۆیە کە لەبەر خاتری شێخێک یان مەلایەک ناچارە مافی دەیان گوند پێشێل بکات! بەڕێوەبەری فلانە دەزگا گەنجێکی نوێخوازی ڕۆشنبیرە، کەچی وەزیرەکەی پیاوێکی بەناوساڵکەوتووی کۆنە بەعسیی ئەوتۆیە کە بواری هیچ کارێکی گەنجانەی باشی پێ نادا... هتد.

کورد دەڵێ «سەری دوو بەرانان لەناو مەنجەڵێکدا ناکوڵێ». ئەمە لە کاتێکدا کە کوردستان ئەمڕۆ لەوە دەچێ نەک سەری دوو بەران بەڵکو سەری حەوت هەشتی بەرانیشی پێکەوە تێدا بکوڵێ: کۆن و نوێ لە یەک کاتدا، پیر و گەنج لە یەک کاتدا، شارستان و گوندی لە یەک کاتدا، ئەورووپادیدە و عەشایەرێک لە یەک کاتدا..!

٤) دووفاقەیی نێوان واقیع و خۆزگەکانی گەنجان

گەنج ئەو فیلم و گۆرانی و بەرنامە و بابەتانەی لە تەلەڤزیۆن و سەتەلایت و ئەنتەرنێتدا دەیانبنیێ جیاوازییان هەیە لەگەڵ واقیع. تەماشا دەکا لەوێدا زۆر ئاسایی و ئاسانە دوو گەنج یان دوو خوێندکاری زانکۆ لەژێر درەختێکدا دەسلەملانێی یەکترن و دەمیان لە دەمی یەکتردایە (تەنانەت لە کلیپە کوردییەکانیش هەندێ جار دیمەنی ئاوها دەبینێ) بەڵام لە واقیعی خۆیدا ئەمە عەیب و عارێکی زۆر گەورەیە.

لەناو کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار و بەیاننامە و ئامرازەکانی دیکەی ڕاگەیاندندا تەماشا دەکات: مافی مرۆڤ، مافی ئافرەت، مافی منداڵ، ئازادیی دەربڕین، ئازادیی ڕۆژنامەگەری، کۆمەڵگەی مەدەنی، دیموکراسی، ئاوەدانکردنەوە، خزمەتگوزاری.. دەیان چەمک و زاراوەی دیکەی

دروەشاوە بەلێشاو دادەمەزرێنە ناو سیستەمی بیرکردنەوەیەوە، کەچی لە واقیعدا، ئەگەر نەڵێم هەمیشە ئەوا زۆربەی جاران دەبینێ هەموو شتەکان بەپێچەوانەی ئەم قسە فشە و درۆ و دەلەسانەن:

تەماشا دەکا: لەو پایتەختە گەورەیەی کوردستانی «ئازاد و مەدەنی و دیموکرات و پڕ خزمەتگوزارییەدا!» کە نیو ملیۆن تەڵەبە و گەنج و نەوجەوانی تێدا دەژی، تەنیا یەک کتێبخانەی گشتیی بچکۆڵەی پەڕپووتی لێیە و ڕۆژانە (لەبەر بەربادیی شوێنەکە و لێکترجوداکردنەوەی کوڕ و کچ و نەبوونی کافیتریا و ئەنتەرنێت و کارەبا و هۆی دیکە) تەنێ پەنجا قوتابییەک ئەگەر ڕووی تێ بکا. لەوە دەچێ حکوومەت و «پەرلەمانی پیر» واتێ بگات کە گەنج و قوتابیی کورد تەنیا بە نان دەژی! تەنیا و تەنیا پەنیری کیری و ڕۆنی «زەڕ» و هەنگوینی سعوودی و کۆڕن فلێکسی سوێدی بۆ گەنج و قوتابییانی کورد دەهێنێتە ناو وڵات: بێ خەبەر لە هەموو کتێب و سەرچاوە و گۆڤار و ماتێریاڵێکی دیکەی مۆدێرنی ڕۆشنبیری و زانستی و هونەریی ئەورووپا و وڵاتانی دیکە..

تەماشا دەکا: لەو پایتەختە گەورەیەی کوردستانی «ئازاد و مەدەنی و دیموکرات و پڕ خزمەتگوزارییەدا!» کە نیو ملیۆن تەڵەبە و گەنج و نەوجەوانی تێدا دەژی، تەنانەت یەک شوێنی ڕابواردنی گەنجانە و تەفریح و دڵخۆشبوونی خێزان یان مەدینەتولعابێکی لێ نیە..

ئێوە دەزانن ژیانی شەو لە کوردستاندا کوژاوەتەوە!؟ مەبەستم لە کوژانەوەی ژیانی شەو، کوژانەوەی گڵۆپ و ئەلەکتریک و کارەبا نییە؛ کە ئەمەیان هەر بەشێوەیەکی سروشتی و ئاسایی و بەردەوام کوژاوەتەوە! مەبەستم هەر ژیان خۆی، ژیانی گەنج و قوتابیی کورد، بە شەوان، بەردەوام کوژاوەتەوە! یەعنی، دەتوانم بڵێم: مرۆڤی کورد بە شەوان - لە کاتژمێر شەشی ئێوارەوە تا حەوتی بەیانیی ڕۆژەکەی تر، دەمرێ. ناژیت. ئەمە تەنانەت لەو شوێن و شەوانەشدا هەر وایە کە کارەبا هەیە: مەگەر شەقامێک نەبێ لە ناوەڕاستی شاردا کە ئەویش کارەبا و ڕووناکی و ژیانە دروەشاوەکەی، دەگەڕێتەوە بۆ دەڤەرە تایبەتی و دوکانداره بەستەزمانەکانی ئەو شەقامە کە بە پارەی خۆیان و بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ئەوێیان

ڕازاندۆتەوە (بەبێ هیچ پلان و نەخشەیەکی کە پێویست وایە پارێزگا بۆ هەموو جادە و بازاڕ و شەقام و گەڕەکێک دایبنێت!).
ئاخر، زۆر بەدەگمەن لە گۆشەیەکی ئەم پایتەختە خۆڵەمێشیە پڕ تەپوتۆز و هیلاک و بێ ئاوەدا- کە ناوی هەولێرە- قوژبنێکی تەڕ یان سووچێکی درەوشاوەی ڕەنگینی ئەوتۆ دەبینیت کە حەز بکەیت رووی تێ بکەی یان تێیدا دابنیشیت. نەک مۆسیقا و ڕەنگ و تەڕایی، بەڵکو رووناکیی گڵۆپەکانیش، سەرتاپا کوژاونەتەوە.

٥) عیراقچێتی و کوردستانچێتی

پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتیی نیشتیمانیی کوردستان کە دوو حزبی فەرمانڕەوای کوردستانن، لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ساڵی (٢٠٠٥)دا، بەشێوەیەکی فەرمی ئاگادار کرانەوە کە نەک تەنیا نەسلی نوێ، نەک تەنیا گەنج و خوێندکار و نەوجەوانی ئەمڕۆی کورد، بەڵکو سەرتاسەری خەڵک دەیانەوێ لە دەوڵەتی ڕەشی عیراق جودا ببنەوە؛ لە سەدا نۆود و حەوت و پۆینت سێ ی خەڵکی کوردستان ٩٧/ . حەزدەکەن بگەنە ئازادیی نەتەوەیی خۆیان، دەشزانن: هەموو مەرگەسات و دۆزەخی ژیانی ئەوان لەمەوە دێت کە «عیراقین»! کەچی لە ڕاگەیاندنی هەر دوو حیزبەکە و حکوومەتیشدا تەنانەت لە بەستێنی پەروەردە و زانکۆ و کولتووریشدا پانتاییەکی فراوان بۆئەوە تەرخان کراوە کە لە خەڵک، لە نەوجەوان و گەنج و قوتابیان بگەیەنن کە ئێمە عیراقین و »عیراق چاوی لە ئێمەیە!».
ئەم ئیزدیواجیەت و دوو فاقییە ئایدیۆلۆژییە، گەتج و خوێندکار و نەسلی ئەمڕۆ سەرگەردان و حەیران دەکا: مەترسییەکی گەورەی بۆ سەر ئەمڕۆ و داهاتووی وڵات هەیە.
من نەک ئەگەر مودیری دەزگای ڕاگەیاندنی حیزبێکی خەباتگێڕی وەک پارتی دیموکراتی کوردستان بم، نەک ئەگەر سکرتێری گشتیی ڕاگەیاندنی یەکیەتیی نیشتیمانیی کوردستان بم، تەنانەت ئەگەر حەمامچییەکی فەلەی نەخوێندەوار یان کوورەچییەکی تورکمانیش بم (لەکاتێکدا ئەگەر دڵنیا بم

سەرتاپای میللەتی کورد دەیەوێت لە عیراق جودا بێتەوە) بەڕاستی لەڕووم نایەت و نایەم (بە پارە و پوولی خۆشم و میللەتەکەشم) زوڕنا بۆ عیراقچێتی و «دەوڵەتی عیراقی ئیبراهیم جەعفەری» لێ بدەم و سروودی «موطنی، موطنی..» لە سەتەلایتی کوردستان تی ڤی و کوردساتدا بەردەوام بەردەوام لێ بدەمەوە!

کەچی لەلایەکی دیکەشدا (هەزاران ئافەرین بۆ جەنابی سەرۆک مەسعوود بارزانی..) کە هاتووە تا ئێستاش هەڵواسینی ئاڵای پیسی عیراقی لەسەر خاکی خاوێنی کوردستانی فیدرالّدا قەدەغە کردووە: چونکە دەزانێ گەنج و نەوجەوان و خوێندکارانی کورد ئەمەیان دەوێت.

کەواتە، ئەم ئیزدیواجیەت و دوو فاقییە ئایدیۆلۆژییە، تەنانەت بەرنامەی سەرکردایەتیی کوردیشی گرتۆتەوە: جەنابی مام جەلال سەرۆکی عیراقە و بەرگری لە یەکپارچەیی خاکی عیراق دەکات، کەچی جەنابی سەرۆک مەسعوود بارزانی، سەرۆکی حکوومەتی هەرێم، تەنانەت هەر ئاڵای عیراقیشی هەڵنەواسیوە «بەڵام ئەویش هەر هێشتا بە ڕاگەیاندن دەڵێت کە قەوانە کۆنەکەی «موطنی موطنی..» لێ بدەنەوە. بەڕاستی کەس تێیان ناگات: گەنج و خوێندکار و نەسلی ئەمڕۆیان سەرگەردان و ڕاڕا و نائارام کردووە!



# که تۆ هاتی له نەومیدی نەما باس
# له هیجر و ئینتیزار ئیدی نەما باس

نالی

پێشتر ئاماژەمان بەوە دا که لەئاکامی دروستبوونی شار و پێشکەوتنی کۆمەلایەتیدا، توخمێکی دیکەی گرنگ و ئەکتیف دەنێو ژیانی پەروەردەیی و کولتووریی کورددا سەوز بوو، ئەویش ئافرەته.

ئافرەت که پێ دەخاته نێو ئەم دوو مەیدانەی پەرورده و کولتوور، پێش بیرکردنەوە و هەنگاوهەڵنانی خۆی، به هاندانی پیاو کارەکەی بۆ مەیسەرتر دەبێت. ئەودەمەی ئەم هەنگاوەش هەڵدەنێ چ بزووتنەوەی فێمینیستی و خۆبادانی پێشوەختی ئەو ژنه ئەورووپادیده و ناشیرین و لەمێرد دابڕاوانەیان لەپشتەوە نەبووە که واتێدەگەن ئەگەر ئەوان نەبن ئیدی ئافرەت پێش ناکەوێت! مەبەستم ئەوەیه ئالوگۆڕەکه لەئەنجامی پێشکەوتنێکی سروشتی و بێ زۆرلەخۆکردن و بانگاشەکردن بووە. له سەرەتادا چەند شاعیر و مەلایەکی وەک حاجی قادری کۆیی و مەلای گەوره ئنجا چەند ڕووناکبیرێکی دیکه هانی ئافرەتان دەدەن یان کچی خۆیان دەنێرنه بەر مەکتەبێ، ئەمەش لەسەرەتادا دەبێته «عەیبێک» و بەو کچانه دەڵێن «مەکتەبلی»، پاشان ئیتر دەبێته چاولێکەری و مۆده، ورده ورده ئافرەت دێته ناو ژیانەوە و بەهای خۆی پەیدا دەکاتەوە، وەک نالی دەڵێ:

شیرین کچ و لەیلا کچ و سەلما کچ و عەذرا کچ
نەخلی ئەمەر و مایه بۆ دەوڵەتی دنیا کچ

من ناتوانم بیسەلمێنم، بەڵام پێم وا نیه ئافرەتی کورد پێش ۱۹۲۰ قوتابخانەی دیبێت، یان ئەسڵەن هەر له له صەد یەکیش ژنی کورد هەر خوێندەواریشی بووبێت: مەگەر ژنێکی وەک مەستووره خانمی ئەردەلانی که حەتمەن دیاره له کۆشکی خانایەتیی بنەماڵەکەیدا مامۆستای تایبەتی بۆ گیراوه! کەواته وا ڕێی تێدەچێ لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان بۆ کوردستان

(١٩١٧) واتە لەگەڵ کرانەوەی یەکەمین قوتابخانە مۆدێرنەکان بۆ کوڕان لە شاری سلێمانی و هەولێر، بیر لەوەش کراوەتەوە کە قوتابخانەی تایبەت بۆ کچانیش بکرێتەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەیش کە یەکەمین ڕێکخراوی ژنان (کورد قادین جەمعیەتی) لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٩١٩ دامەزراوە.

هەڵبەتا قۆناغ بە قۆناغ و لە شێوەی پەرەسەندنێکی هەنگاو بەهەنگاوی سروشتیدا، ئافرەت توانیویەتی بگاتە ئەو ئاستە نیمچە پێشکەوتووەی بتوانێ بێتە ناو ژیانی پەروەردەیی و کولتووری و زانستی و تەنانەت سیاسەتیشەوە.

ئەوەی پێوەندیی بە چوارچێوەی باسی منەوە هەبێت ئەوەیە کە ئافرەت - نازانم لە کەیەوە، بەڵام لەو ڕۆژەوەی بووە هاوپۆل و هاوڕێ و هاوکار و هاوهەنگاوی پیاو- ئیدی جۆش و خرۆشێکی دیکەی، واتە بەگوڕ و بەتینی، بەخشییە پیاو؛ بەکورتی: جەسارەتی پیاوی (ئەگەر کوڕ ئەگەر پیاو، ئەگەر پیاوی بەژن ئەگەر پیاوی بێ ژنی) زیاتر کرد؛ بزاڤی ئازادیخوازانە و گۆڕانخوازانەی بەجۆشتر کرد. چونکە جاران ئافرەت لای پیاو، تەنانەت لای پیاوە هەرە حەسساس و شاعیرەکانیش، کائینێکی ون و نەناسراو بوو، وێنەیەکی سادییانەیشی هەبوو. (ئەدەب) ئاسا کاتێ کچێکیان دەدیت ئیدی ئەوسەری دونیایان لێ دەهاتەوە یەک:

قامەت نیە باللە قیامەت بوو هەڵستا
لەو شۆڕش و غەوغایە کە پەیدایە لە باڵات

پیاوی کورد (بە شاعیرانیشەوە) واتێدەگەیشتن کە ئافرەت ئیدی لە «ئازاردانی پیاو» و «کوشتنی پیاو» زیاتر بە غەمزە و ناز و عیشوەکانی، ناتوانێت و نازانێت هیچی دیکە بکات، بۆیە شیعری کلاسیکمان پڕەلەم باس و خواس و لیکچوواندنانە (فەوجی سەرباز و جەیشی هجووم و تیری غەمزە و هۆلاکۆی چاو..).

ئەمە لەکاتێکدا کاتێ ئافرەت دێتە ناو ژیانەوە، تێگەیشتنی پیاو لەبارەی ئافرەت و تەنانەت لەبارەی خودی ژیانیشەوە دۆخێکی سروشتی و

واقیعی وەردەگرێت (بەرهەمەکانی گۆران شایەدی ئەم حاڵەتەن) ژیان دەبێتە پرۆژە و ژینگەیەکی هاوبەش بۆ هەردووکیان؛ خەبات و تێکۆشانیش بۆیە -لەئەنجامی ئەم پێکەوەییەدا- جوانتر و پڕ ماناتر، دەدرەوشێنەوە. ئەوەتا پیرەمێرد گەواهیمان بۆ دەدات کە هاتنی ئافرەت بۆ ناو ژیان هاوزەمان و هاوهەنگاوی بەجۆشتربوونی ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان بووە. ئەگەر، بەپێی تابلۆیەکەی دیلاکرۆا ئافرەتی فەرەنسی لە ساڵی ١٨٣٠دا بەیداخی شۆڕش بەرزدەکەنەوە و بە سنگی ڕووتەوە ڕرربەڕووی ستەم و ڕۆتین و دەسەڵات دەبنەوە، ئەوا لە کۆمەڵگەی کوردستاندا صەد ساڵێک دوواتر ئەم واقیعە بە چاوی خۆمان دەبینین کە ئافرەت هاوخەم و هاودەردی پیاو یاخی ببێت و بەپێش ڕاپەڕینەکان بکەوێت:

تا ئێستا ڕووی نەداوە لە تاریخی میللەتا
قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا

ئەم شیعرەی پیرەمێرد ئەوە نیشان دەدا کە ئافرەت، کاتێ دێتە مەیدانەوە، بەڕاستی توانیویەتی گڕی یاخیبوون و ڕاپەڕینەکان بەجۆشتر و خۆشتر بکات. ئەمەش نەک بەشێوەیەکی جودا و لە قوڵێکی دیکەوە یان لە ڕیزێکی دیکەوە -وەک لە بزاڤە فێمینیستییە نەخۆشە ئاورووپاییەکاندا دەیبینین- بەڵکو ئەو یاخیبوون و ڕاپەڕینە بۆ ئافرەت مەسەلەیەکی بوونی ئینسانیانە Existancialisme بووە لە چوارچێوە گشتییەکەی کۆمەڵدا پێکەوە (کە ژن و پیاوە) چونکە زانیویەتی کە هەرچی پێشکەوتنێک بێتە دی بەو ڕاپەڕینە پێکەوەییە لەپێناو ژیانی هەمووواندا بۆ ئەویشە!

جاران پیاو لەتاو کەپتی سێکس و بێ بەری بوون لە نیعمەت و هێزە جوانەی ژن، هەمیشە خۆی وەک ئەسیر و پیر و ئوفتادەیەک هاتۆتە پێش چاو. ئەوەتا (ئەدەب) دەڵێ:

عومرم گەییە ئاخر و ماچێکی جانانم نەکرد
یەک نەزەر تێرم تەماشای ماهی تابانم نەکرد

بەڵام تۆ تەماشاکە کاتێ ئافرەت نزیک پیاو دەکەوێتەوە، کاتێ ئەوینێک لەلای ئەم دووانە سەرهەڵدەدا، پیاو ( بۆ نموونە مەحوی) چ هێز و متمانەیەک بە خۆی پەیدا دەکا:

عیشق ئاگرێکە بەربووە هەر کەس دەبێ بە کەس
گەر ڕۆژڕەش وەک شەوە بێ، بوو بە شەوچراغ

یان دەڵێ:

لە بەردەرگاهی عیشقا یەکسەرە هەر کەس سەری دانا
ئەگەر پەتیارەیەک بوو، بوو لە سەد عەللامە داناتر

ولیەم ڕایش، خاوەن کتێبی (شۆڕشی سێکسی) حەفتا ساڵ دووای مەحوی ئەم بیرۆکەیەی لە تێورێکی دەروونناسیانەدا داڕشتۆتەوە: بەرهەڵداکردنی ئارەزووەکان و حەزە کەپتکراوەکان دەبنە مایەی پێشکەوتن و ئارامی و ئاسوودەیی و داهێنان. لەوە دەچێ ئەسکەندەری مەکەدۆنیش هەمان بۆچوونی هەبووبێت بۆیە گوتوویەتی: «حەوت پیاوی عاشقم بدەرێ هەموو دنیام بۆ دەگرم».

بەم شێوەیە، هاتنی ئافرەت بۆ ناو قوتابخانە و زانکۆ و بۆ ناو هەر مەیدانێکی دیکەی کار، لەباری فیزیک و دەروونییەوە، وزەی پیاو بۆ تێگەیشتن لە ژیان و چەمکەکانی پەیوەندییان بە ژیانەوە هەیە زیاتر دەکات، لەئاکامدا هێزی پیاو بۆ یاخیبوون و شۆڕشەکان، بەجۆشتر دەکات. چونکە ئەو بەردەوام لەئەنجامی جوانی و ئامادەییە جوانەکەی خۆی، ژیان و داهاتوو لەلای پیاو جوانتر و پڕ چێژتر و پڕ ماناتر دەکات، وای لێدەکات کە هەست بکات ژیان بەڕاستی شایستەی ئەوەیە خەباتی بۆ بکەیت و هەرچی جەربەزەییەکی بۆ بکەیت. ئەوەتا نالی باسی ئەو ئامادەییە جوانەی کچ دەکات:

ئەی جیلوەدەری حوسن و جلەوکێشی تەماشا!
بەو شەهدی کەلامەت کە بە ئیشرابی لەتافەت
لەززەت دەگەیەنی بە دڵ و زیهنی موخاطەب

دیارە کچ و کوڕانی هاوچەرخیشمان باش دەرکیان بەم ڕاستییە کردووە، بۆیە یەکێک لە دروشم و داخوازییەکانی خۆپیشاندان و ڕاپەڕینەکانیان بریتی بووە لە وێرانکردنی یەکجارەکیی ئەو دیوارە ئەستوورەی لەنێواندایە، هەروەها زەمینەخۆشکردن بۆئەوەی کچ و کوڕ بتوانن بەیەکتر بگەن و یەکتر ببین و بەشێوەیەکی سروشتی و ئازادانە بژین ..

ئەمڕۆ، لە ۱۹۹۱ بەملاوە، درستبوونی ئەو هەموو کۆمەڵە و سەنتەر و ڕێکخراوانەی ژنان و ئافرەتان، ئەگەرچی هەندێکیشیان ئامانج و ئایدیۆلۆژیای سەنتەر و ڕیکخراوەکەیان تەسک کردۆتەوە تا ڕادەی «ژنانەیەتی» بەڵام لەکۆتاییدا هەر خزمەتی بزاڤە یاخیگەراکەی قوتابیان و گەنجان دەکەن.

هاتنی ئافرەت بۆ ژیان، بێگومان، لەباری دیمۆگرافیشەوە، وایکرد ژمارەی ئەوانە زیاد بکات کە ئەکتیڤ و چالاکن لەم بەستێنەی خەباتی گەنجانە و خوێندکارانەدا. واتە لەباری چەندێتییەوە وایکرد ژمارەی یاخیبووەکان ڕوو لە زیادبوون بکات..



# بۆ بنێژرێ نەوجەوانی پێگەیشتووی وەک نیهاڵ؟!

حەمدی

بۆئەوەی زانکۆ ببێتە هی هەموومان؛ پێویستە هەر هەموومان، بەتایبەتیش بە خوێندکارانەوە، کچ و کوڕ، ئازاد بین لە بنیاتنانەوەیدا.

بۆئەوەی پەروەردە و قوتابخانەکان، ببنە هی هەموومان؛ پێویستە هەر هەموومان، بەتایبەتیش بە قوتابیانەوە، کچ و کوڕ، ئازاد بین لە بنیاتنانەوەیدا.

بۆئەوەی کوردستان ببێتە هی هەموومان؛ پێویستە هەر هەموومان، بەتایبەتیش بە گەنج و نەوجەوانانەوە، کچ و کوڕ، ئازاد بین لە بنیاتنانەوەیدا.

ئەمە مانای وایە هەر لە مامۆستاکانەوە تا دەگاتە میر و مودیر و مەلا و مامۆستاکانی زانکۆ و سەرۆک بەش و «دینگە» و سەرۆک زانکۆ و بەڕێوەبەرە گشتی و وەزیر و پرۆفیسۆر و پیر و پەرلەمان؛ پێویستە بە پلەی یەکەم و پێش هەموو شتێک، لەمەودووا، گیروگرفتەکانی گەنج و نەوجەوانان، هەروەها داخوازییەکانی خوێندکاران بخەنە بەرنامەی هەرە لەپێشی کاری خۆیانەوە.

پازدە ساڵ زیاترە هەر دوو حزبی فەرمانڕەوا و حکوومەت هەوڵدەدەن - توانیویانە - نەسلێکی نوێی ئازادیخوازی بەتوانا و نیمچە دیموکرات دروست بکەن؛ توانیویانە «هێزێکی نوێ» دروست بکەن. دەستیان خۆش بێ و ئافەرین! بەڵام پرسیار ئەمەیە: ئەدی مەسەلەی بەگەڕخستنی ئەم هێزە نوێیە؟ ئەدی مەسەلەی سوودوەرگرتن لەم نەسلە نوێیە؟ ئەدی ئایا پێویست ناکات کارێکی وابکرێت پێداویستی و خۆزگە و گرفت و داخوازییەکانی ئەو هێزە نوێیە، لەبەرچاو بگیرێت؟!

ئەم نەسلە نوێ و ئازادیخوازەی ئەمڕۆ ئێستا لە خۆی دەپرسێ:

«باشە، حکوومەت منێکی ئاوها جیاواز و ئازادیخواز و یاخیگەر دروستکرد، ئەدی بۆچی بوارم پێ نادا ڕۆڵی خۆمم هەبێ؟ ئەدی بۆچی کار

و پایە و ئەرکێکم پێ ناسپێرێ؟ بۆچی بەتەنگ پێداویستی و خۆزگە و گیروگرفت و داخوازییەکانمەوە نایەت؟».. 

ئەم نەسلە نوێ و ئازادیخوازەی ئەمڕۆ ئێستا لە خۆی دەپرسێ:

«بۆچی هیچ نەبێ چەند کورسییەکم نەبێ لە پەرلەمان؟ بۆچی نوێنەرێکی قوتابییانی پەروردەم نەبێ، بۆچی نوێنەرێکی خوێندکارانی زانکۆم نەبێ، بۆچی نوێنەرێکی نەوجەوانانم نەبێ، بۆچی نوێنەرێکی گەنجانم نەبێ لەناو پەرلەماندا؟».. 

ئەم نەسلە نوێ و ئازادیخوازەی ئەمڕۆ ئێستا لە خۆی دەپرسێ:

«من بە پەرلەمانێکی ئاوها چۆن ڕازی ببم کە سێ چارەگی ئەندامەکانی پیرن: لە داخوازی و گرفت و خۆزگەکانی گەنج و خوێندکاران تێناگەن؟ من لەو پەرلەمانە چۆن یاخی نەبم کە چارەگێک زیاتری ئەندامەکانی بە (گەل) دەڵێن «گەڵ» و لەوەش ناخۆشتر: قەڵەم و گێزەریش لەیەکتری جیا ناکەنەوە؟! من چۆن ئەو پەرلەمانە بە هی خۆم بزانم کە چارەگێک زیاتری ئەندامەکانی، کۆنە جاش و کۆنە بەعسی و ئەو ڕەئیس عەشیرەتانەن کە دەیانەوێ نەریت تا هەتایە نێڵی گەردەنی گەنج بمێنێتەوە؟! ».

گەنج و خوێندکاران (بەشێوەیەکی گشتیش نەسلی نوێ) لەبەر خاتری لەسەر سەری خۆ دانانی «ئاڵای کوردستان» و لەبەر خاتری «ئەمنی قەومیی کورد» تاکو ئێستاش، ئەو هێزە خەتەرناک و یاخییەی ناو شەقامەکانیان پیشانی (دەسەڵات) نەداوە، بەڵام توانیویانە - هیچ نەبێ لەڕێگەی ئەو خۆپیشاندان و مانگرتنانەی ساڵانی ڕابردووەوە- توانیویانە هەڕەشەی خۆیان لە حزبە فەرمانڕەواکان و حکوومەت بکەن و پێیان بڵێن:

وڵات پێویستی بە ریفۆرم هەیە!

کۆمەڵگەمان پێویستی بە ریفۆرم هەیە!

ڕاستییەکەیشی: سیاسەت چەند زیاتر لە گرفتەکانی تاکەکەس نزیک ببێتەوە ئەوەندە زیاتر بەشداربوون لە ژیاندا ڕاستەوخۆتر دەبێ.

حزبە چەپەکان (کوردستانییەکان) بەتایبەتیش حیزبە فەرمانڕەواکان زۆر بەهێزترن لە سەندیکا و ڕێکخراوەکان تەنانەت دەستڕۆشن بەسەریاندا،

جگە لەمەش ناوەرۆکی ڕێکخراوە خوێندکاری و گەنجانە و پیشەییەکانیان قۆرخ کردووە و بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دەکاریان دەهێنن. ئەمە هۆکارێکی ڕاستەوخۆی لاوازبوونی دیموکراسییە لە وڵاتی ئێمەدا، کۆسپێکی ئەستوور و زەبەللاحە لەبەردەم پێشکەوتنی ئاسایی و سروشتیی کۆمەڵگەی کوردستاندا.

نموونەم بۆ سەلماندنی قسەکانم:

١) لە کاتی خۆپیشاندانەکانی مانگی دیسەمبەری (٢٠٠٢)ی قوتابیانی زانکۆی سەلاحەدین بۆ وەدیهێنانی داخوازییە ڕەواکانیان، هەروەها لەکاتی خۆپیشاندانەکانی خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی دژی لەشکرکێشیی تورکیا، هەر دوو حیزبی پارتی و یەکیەتی، بە دار و ئاگر و بەندیخانە ڕووبەڕووی خوێندکاران و قوتابیان بوونەوە.. لەوەش زیاتر یەکیەتیی قوتابییانی کوردستان و کۆمەڵەی خوێندکارانی سەر بە یەکیەتیی نیشتیمانی لە سلێمانی خۆیان لەو دوو خۆپیشاندانە هەژەندە بێ ساحێب کردو تەنانەت دەوری پۆلیس و ئاسایشیان بینی لە بەرەنگاریبوونەوەی ئەو خۆزگە و هەڵوێستە جوانانەی قوتابیان و خوێندکاران.

٢) لە خۆهەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستانی ساڵی (٢٠٠٥)دا، بەپێی ڕۆژنامەی (چاودێر) کە لە مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی سلێمانی دەردەچێت: تەنیا لە سەدا یەکی ڕێکخراوەکان (بۆ هەموو کوردستان!!) بەشیان هەبووە بۆ نوێنەرایەتیی سەندیکا و ڕێکخراوەکانی کوردستان لە پەرلەمانی نوێماندا.

ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو ئەو قسانەی حیزبەکان دەیکەن لەبارەی «پێویستبوونی کاری مونەسسەساتی» و «کۆمەڵگەی مەدەنی» و «دیموکراسی» و «دەوری ڕیکخراوەکان».. لەلای گەنج و قوتابی، پێویستە بە هەڵخەڵەتاندنی میللەت حسێبی بۆ بکرێت! ڕاستیش دەرچوو، ئەوەتا: لە سەدا یەکی ڕێکخراوەکان ئەندامن لەناو پەرلەمانی نوێی کوردستاندا بەرامبەر لە سەدا نۆوەد و نازانم چەندی ئەندامی حیزب و پیر و میر و کۆنە جاش و کۆنە بەعسی و ماستاوچییەکانی «گەل».

٣) لە کاتی خۆپیشاندانە بەزەبر و ڕەوا و جوانەکەی سەدان مامۆستایانی سلێمانی کە هەموو کوردستانی لە مانگی مایسی (٢٠٠٥)دا ڕاچڵەکاند، سەندیکای مامۆستایانی کوردستان لە سلێمانی، لە هەر هەموو میدیاکاندا ڕۆڵی درۆزنانەی دەبینی و کەوتبووە سەنگەری حیزب و حکوومەتەوە.

٤) هەر لە ئەنجامی ئەم دەستڕۆییەی حیزب بەسەر سەرجەم سەندیکا و کۆمەڵە و ڕێکخراوەکاندا، خەڵک (تەنانەت ڕۆشنبیر و مامۆستای زانکۆش) وایان لێ هاتووە کە ئیرادەی خۆیان و جڵەوی خۆیان سپاردۆتە دەست حزبەکان - حکوومەت.. تاقەتی ڕادەربڕین و یاخیبوون و «ئەم شتە قۆڕانەیان» نەماوە و تەسلیم بوونە: ئەوەتا پێش خۆهەڵبژاردنەکانی پەرلەمان، خەڵک باش باش دەیزانی بڕیارەکان چی دەبن و ئەنجامەکان چۆن دەبن! لە بزاڤی نەتەوەییشدا ئەوەتا دەیان ساڵە تەنیا حیزب بڕیاردەدات چی بکەین، تەنیا حیزب بڕیار دەدات چۆن دەبێت..! خەڵکی چی و میللەتی چی و دیموکراسیەتی چی؟ دەی .. ئەوە نیە: ٩٧/ . ی گەلی کوردستان بەپێی ریفاندۆمەکە، دەیانەوێ لە دەوڵەتی عیراق جودا ببنەوە! کوا ئەکشنی دیموکراسیانەی ئەم حاڵەتە جەماوەرییە (لەناو پەرلەمانی کوردستاندا و لەناو حکوومەتی هەرێمدا؟).

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو نیمچە دیموکراسییەی هەیە (ئەو هەموو سەنتەر و ڕێکخراوانە) زەمینە خۆش دەکەن بۆ هەنگاونان بۆ ورووژاندنی گرفتەکانی گەنجان و قوتابیان و داخوازییەکانی تاکەکەس و چارەسەرکردنیان. هەر لە ئێستاوە بزاڤی ئافرەتان هەوڵدەدات بیربکاتەوە کە گرفتە تایبەتییەکانی ژنانی کورد بکاتە «گرفتێکی سیاسی». بە هەمان شێوە ڕێکخراوەکانی قوتابیانیش دەیانەوێ بیر بکەنەوە کە بتوانن داخوازییەکانی خوێندکاران «وەک مەسەلەیەکی خەتەرناک» لەلای حکوومەتدا تاوتوێ بکات.

کەواتە، بەڕاستی: بۆئەوەی کوردستان ببێتە هی هەمووومان؛ پێویستە هەر هەموومان، بەتایبەتیش بە گەنج و نەوجەوانانەوە، کچ و کوڕ، ئازاد بین لە بنیاتنانەوەیدا.

بەپێچەوانەی خۆزگە و ئاواتی خوێندکاران، لەدژی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەیی کوردستان، هەر سێ سەرۆکایەتیی هەر سێ زانکۆکانی دهۆک و هەولێر و سلێمانی، لەسەر ئەم ڕێککەوتنە بەرباد و ناماقوولە بێ ئەوەی خۆشیان پێ بزانن ئیمزایان کردووە:

زانکۆی هەر شارێکی کوردستان (بۆ نموونە هەولێر) پێویستە تەنیا قوتابیانی شارەکەی خۆی (هەولێر) وەربگرێت: بەدەگمەن خوێندکارانی شارێکی دیکەی کوردستان (سلێمانی یان دهۆک) لەباوەش دەگرێت. ئەمە مانای وایە زانکۆی دهۆک تەنیا خوێندکارانی دهۆکی، زانکۆی سلێمانی تەنیا قوتابیانی سلێمانی... وەردەگرێت. بەم شێوەیە، عەقڵی عەزیم و پرۆفیسۆرانەی ئەم سێ سەرۆکایەتیی زانکۆیە، کارێکی وایان کردووە کە گەنج و خوێندکاری نەتەوەپەروەر و تینووی ژیانی ئەم سێ شارە بەستەزمانە تا گەنجێتیشیان تەواو دەبێ لە شارەکەی خۆیان نەچنە دەرەوە و تا دەمرن لە شارەکەی خۆیان زیاتر هیچ شارێکی دیکەی کوردستان نەبینن و نەناسن!

ئایا ئەمەی زانکۆکان دەیکەن مەترسیی نیە بۆ سەر «ئەمنی کۆمەڵایەتیی» کوردستان؟

- قوتابیان (کە توێژێکی گەنجن و پێویستیان بە دنیا دیتن هەیە) پێویست وایە لە شارەکەی خۆیان بێنە دەرەوە و بتوانن بۆ خۆیان شارەزای شارێکی دیکەی غەیری شاری خۆیان بن و ئەزموونی نوێ لە ژیانیاندا پەیدا بکەن.

- خوێندکاران لە حاڵەتی دوورکەوتنەوە لە شارەکەی خۆیان و چوونیان بۆ شارێکی دیکە (بۆ نموونە کە کوڕی دهۆکی دەچنە هەولێر) فێر دەبن پشت بە توانا و شەخسیەتی خۆیان ببەستن؛ فێری بەڕێوەبردنی ژیانی خۆیان دەبن و ئەوەندە پشت بە باوانیان نابەستن.

- بەم دوورکەوتنەوەیە خوێندکاران فێری لەهجەیەکی دیکەی زمانی کوردی دەبن (بۆ نموونە کە کچی دهۆکی دەچنە سلێمانی) واتە ستراتیژێکی نەتەوەییە بۆ لەیەکترنزیک خستنەوە و تێکەڵکردنی دیالێکتەکانی زمانەکەمان.

- لەنێوان ئەو خویندکارانەدا (بۆ نموونە: کچە سلێمانییەکان لە هەولێر و

دهۆکدا، کوڕە دهۆکییەکان لە سلێمانی و هەولێردا، کچە خانەقینییەکان لە هەولێر و سلێمانی و دهۆکدا، کوڕە کەرکووکییەکان لە دهۆک و سلێمانی و کەرکووکدا... ) لەنێو ئەو کوڕ و کچە جوان و ئەویندارانەدا حەزحەزۆکانێ و عاشقاتی و خۆشەویستی پەیدا دەبێت؛ واتە دەبێتە هۆی ژنخوازی لەنێوانیاندا؛ پتەوتربوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و دامەزراندنی خزمایەتی - نەتەوەیی لە هەر چوار شارەکەدا.

ئەمەتا بەم شتانە و دەیان شتی دیکە دەردەکەوێ: خودی سەرۆکایەتیی زانکۆ و مامۆستایان بەربەست و سانسۆرن بەسەر پێشکەوتنی مەعریفی و کۆمەڵایەتی و دەروونیی تەڵەبە. لە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی سەلاحەدین ڕۆژنامە خوێندکارییەکان بۆ ماوەی ساڵێک زیاتر داد و بێدادیان بوو لەدەست ئەو سانسۆر و بەربەستانەی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و جلوبەرگ و پەیوەندییەکانی تەڵەبە دانرابوون. دەتوانن بچن لاپەڕەی ئەو ڕۆژنامانە هەڵبدەنەوە و بزانن چ سووکایەتییەک بە جوانی و هێزی تەڵەبە کراوە!

لەلایەکی دیکەوە، تاکو ئێستا بەردەوام مامۆستا بۆتە مەرجەع و خوێندکار هیچ گوێی لێ ڕانەگیراوە، ئەمە لەکاتێکدا لە زۆر حاڵەتدا پێویستە خودی قوتابی بکرێتە مەرجەع. بۆ نموونە لە کۆلێژی پەروەردەدا چەندین جار تەڵەبە مانیان دەگرت بەئامانجی ئەوەی کە مامۆستایەکیان باش نییە و نازانێت دەرس بڵێتەوە، کەچی بەزۆریی زۆردارەکی ئەو مامۆستایە ئێستا و ئێستاش هەر دەرس دەڵێتەوە.. بە قوتابییەکانیشیان گوت: «ئەگەر نەچنە دەرسییەوە هەمووتان فەسڵ دەکەین». ئەمە مانای وایە عەمادە و سەرۆکایەتیی بەش و سەرۆکایەتیی زانکۆ هیچ نرخێک بۆ ڕای قوتابی دانانێن و دەیانەوێ مەعریفە نەزان و پیرەکە تا هەتایە هەر دەسترۆ بێت!

لە سەرۆکایەتییەکانی هەر سێ زانکۆدا مەنهەج و سیستەمێکی وایان داناوە کە خوێندکار هەرگیز بۆی نەبێت بتوانێ ببێتە مەرجەع: بڕیار بدات چ مامۆستایەک پیر و کەنەفت و نەخوێندەوارە بۆئەوەی چیتر نەچێتەوە لای، وە چ مامۆستایەک زانستبەخش و باشە بۆئەوەی هەمیشە سوودی لێ وەربگرێت!

سیستەمێکی وایان داناوە کە هەرگیز قوتابی نەتوانێ بەشێوەیەکی ئازاد سوود لە زانکۆ و مامۆستا و دەرسەکان وەربگرێت: دەیانەوێ قوتابی تا ساڵ تەواودەکات، بیەوێت و نەیەوێت، پێی خۆش بێت یان ناخۆش «وەک ئەوەی قوتابی بەزۆر بەشوو بدرێت» هەر تەنیا یەک هەڵبژاردنی هەبێت: ئەو مامۆستایەی بۆی دەسنیشانکراوە و تەواو!

بە هەمان شێوە لە ماجستێر و دکتۆراشدا: هاتوون دەرسەکانیان دابەش کردووە بەسەر مامۆستا (ب) و (ج ) و (ح) و (د) و (ق). ئیتر قوتابی بۆ هەر دەرسێک دەچێتە لای یەکێک لەمانە و مافی ئەوەی نیە بۆ هیچ دەرسێک بچێتە لای هیچ مامۆستایەکی غەیری ئەمانە لە هیچ کۆلێژ و بەشێکی دیکەدا. ئەم بە زۆر سەپاندنی مامۆستایە بەسەر قوتابیدا چەندین لایەنی نێگەتیڤ و خراپی هەیە:

١) وا لە قوتابی دەکات کە ئەگەر مامۆستاکەی بە دڵ نەبێت و باش نەبێت، دەرسەکەیشی و خوێندنەکەیشی لەبەرچاو بکەوێت.

بەڵام ئەگەر (لە بەکالۆریۆس و باسی دەرچوون و ماجستێر و دکتۆراشدا) بە دڵی خۆی مامۆستا هەڵبژێرێت، ئەوا وانەکەیش و خوێندنەکەیشی خۆشتر دەوێت.

٢) ئەگەر مامۆستا بەزۆر بەسەردافەرزکراوەکەی باش نەبێت، ئەوا هیچ سوودێک وەرناگرێت و پێش ناکەوێت.

بەڵام ئەگەر (لە بەکالۆریۆس و باسی دەرچوون و ماجستێر و دکتۆراشدا) بە دڵی خۆی مامۆستا هەڵبژێرێت، ئەوا بێگومان دەچێ -ئەگەر لە کۆلێژی قانوون بێ یان لە کۆلێژی ئاداب- باشترین و زاناترین مامۆستا هەڵدەبژێرێت. هەر لەم کاتەشدایە کە دەتوانێ سوود وەربگاێت و بێش بکەوێ.

٣) ئەم بەزۆر فەرزکردنەی مامۆستا بەسەر قوتابیدا ڕۆحیاتی مونافەسە لەنێوان مامۆستایاندا ناهێڵێتەوە و دەبێتە هۆی لەپاشدانی مامۆستا و پاڵ لێدانەوەی و مووچە بە ناهەق وەرگرتن: چونکە لەم کاتەدا (قوتابی ڕازی بێت یان نا) ئەوا مامۆستای ناوبراو هەر خۆی مامۆستایە و پێویستی بەوەش نامێنێ کە خۆی ئەوەندە لەگەڵ قوتابیەکە ماندوو بکات.

بەڵام ئەگەر قوتابی خۆی (ئازادانە) ببێتە مەرجەعی بڕیار بۆ هەڵبژاردنی مامۆستا، ئەوا لەم کاتەدا هەموو مامۆستایەک ناچار دەکەونە مونافەسەیەکی شەریفەوە: هەوڵدەدەن باشترین و زیرەکترین و سوودبەخشترین مامۆستا بن (دەچن کەمێک دەشخوێننەوە!!)؛ ئەو مامۆستایانەیش کە لەو مونافەسەیەدا ناتوانن ببنە باشترین و زاناترین مامۆستا، ئیدی بۆ خۆیان پیر پیر دەپووکێنەوە و مامۆستا باش و زاناکان زیاتر و زیاتر لە مەیدانەکەدا دەمێننەوە، ئەمەیە سیستەمی ئازادی زانکۆ! ئەمەیە یەکێک لە داخوازی و هۆی شەڕەکانی خوێندکار لە زانکۆکانی کوردستاندا.

بە هەمان شێوە، دەسنیشانکردنی بابەتی تۆژینەوە، بابەتی تۆژینەوەی (باسی دەرچوون) و (ماجستێر) و (دکتۆرا). دیسان هەر مامۆستای سەرپەرشتیار، یان لیژنەیەکی بەش، یان لیژنەی زانستی دەسنیشانی دەکات بۆ قوتابی. ئەمە لەکاتێکدا زۆربەی قوتابیان حەزدەکەن بۆ خۆیان بابەتەکە (بە ڕاویژکردن لەگەڵ سەرپەرشتیار) دەسنیشان بکەن.

بە هەمان شێوە، دەسنیشانکردنی سەرپەرشتیار، سەرپەرشتیاری (باسی دەرچوون) و (ماجستێر) و (دکتۆرا)، دیسان هەر سەرۆکایەتیی بەش و لیژنەی زانستی دەسنیشانی دەکات بۆ خوێندکار. تەنانەت هەندێ جار بۆ دەسنیشانکردنی سەرپەرشتیار و ئەندامانی گفتوگۆ (عەمید) و (لیژنەی زانکۆی حیزب) و (کۆمیتەی زانکۆی حیزب)یش دەست دەخەنە ناو کارەکەوە (ئەمە وەکو ئەوە دێتە پێش چاوم کە مام و خاڵ و باپیر و پلک و ئامۆزا بڕیار بدەن کچەکەیان بە مێرد بدەنە کێ؟!).

ئەمە لەکاتێکدا بێگومان قوتابی کائینێکی ئازادە و حەزدەکا خۆی سەرپەرشتیارێکی زانا و سوودبەخش بۆ تۆژینەوەکەی خۆی هەڵبژێرێت و ئەندامانی گفتوگۆش (بە ڕاویژکردن لەگەڵ سەرپەرشتیار) دەسنیشان بکەن. ئەم نەریتە ئازادە لە هەموو زانکۆکانی دنیا باوە و فۆرمێکی قانوونی و دروستیش هەیە. ئیدی ئەمە کۆنفرانس و کۆنگرە و خەرج کردنی سێ ملیۆن دۆلاری بۆ چییە؟ بڕیارێکی ریفۆرمیستە و سەرۆکایەتی زانکۆ دەیدات و دەبڕێتەوە.

FLUXSHOPS AND FLUXFESTS IN NEW YORK
AMSTERDAM NICE ROME MONTREAL TOKYO
V TRE-FLUXMACHINES-FLUXMUSICBOXES
FLUXKITS-FLUXAUTOMOBILES-FLUXPOST
FLUXMEDICINES-FLUXFILMS-FLUXMENUS
FLUXRADIOS-FLUXCARDS-FLUXPUZZLES
FLUXCLOTHES-FLUXORGANS-FLUXSHIRTS
FLUXBOXES-FLUXORCHESTRA-FLUXJOKES
FLUXGAMES-FLUXHOLES-FLUXHARDWARE
FLUXSUITCASES-FLUXCHESS-FLUXFLAGS
FLUXTOURS-FLUXWATER-FLUXCONCERTS
FLUXMYSTERIES-FLUXBOOKS-FLUXSIGNS
FLUXCLOCKS-FLUXCIRCUS-FLUXANIMALS
FLUXQUIZZES-FLUXROCKS-FLUXMEDALS
FLUXDUST-FLUXCANS-FLUXTABLECLOTH
FLUXVAUDEVILLE-FLUXTAPE-FLUXSPORT
BY ERIC ANDERSEN - AYO - JEFF BERNER
GEORGE BRECHT-GIUSEPPE CHIARI-ANT-
HONY COX - CHRISTO - WALTER DE MARIA
WILLEM DE RIDDER - ROBERT FILLIOU
ALBERT FINE-HI RED CENTER JOE JONES
H. KAPPLOW-ALISON KNOWLES JIRI KOLAR
ARTHUR KØPCKE-TAKEHISA KOSUGI-SHIGE-
KO KUBOTA-FREDRIC LIEBERMAN-GYORGI
LIGETI-GEORGE MACIUNAS-YOKO ONO-BEN-
JAMIN PATTERSON-JAMES RIDDLE-DITER
ROT-TAKAKO SAITO-TOMAS SCHMIT-CHIEKO
SHIOMI-DANIEL SPOERRI-STAN VANDER-
BEEK-BEN VAUTIER-ROBERT M. WATTS
EMMETT O. WILLIAMS-LA MONTE YOUNG
FLUX-ART-NONART-AMUSEMENT FORGOES
DISTINCTION BETWEEN ART AND NONART,
FORGOES ARTISTS INDISPENSABILITY,
EXCLUSIVENESS, INDIVIDUALITY, AMBITION,
FORGOES ALL PRETENSION TOWARDS SIG-
NIFICANCE, RARITY, INSPIRATION, SKILL,
COMPLEXITY, PROFUNDITY, GREATNESS,
INSTITUTIONAL AND COMMODITY VALUE.
IT STRIVES FOR MONOSTRUCTURAL, NON-
THEATRICAL, NONBAROQUE, IMPERSONAL
QUALITIES OF A SIMPLE, NATURAL EVENT,
AN OBJECT, A GAME, A PUZZLE OR A GAG.
IT IS A FUSION OF SPIKES JONES, GAGS,
GAMES, VAUDEVILLE, CAGE AND DUCHAMP

تاکو ئێستا بەردەوام بەردەوام لە هەموو کێشەیەکدا بەپێی قانوونێک (کە لە بەرژەوەندیی مامۆستا و لەدژی قوتابی دانراوە) لە هەموو کێشە و گرفتێکدا، بام خەتای مامۆستاش بێت، بەڵام هەر پێویست وایە پشتی مامۆستا بگرین و قوتابیی تێدا تاوانبار بکرێت. لە چەندین کێشەدا بۆ نموونە مامۆستا تەحەڕوشی قوتابیی کچی کردووە یان تەعەدای ی کردووە یان لە حاڵەتی دیکەدا دژی قوتابیی کوڕ ناشیرینیی نوواندووە، کەچی مامۆستاکە لەجیاتی ئەوەی فەسڵ بکرێت بردوویانە لە بەشێکی دیکە یان لە کۆلێژێکی دیکەدا کردوویانە بە سەرۆک بەش.

ئەمە جگە لەوەی کە لە زۆربەی پۆلەکانی قوتابخانەکان و زانکۆکانی کوردستاندا، وەڵامی پرسیارەکانی خوێندکاران بە (پرسیار مەکە) و تف و (وس بە!) و (بیبڕەوە) و جنێو دەدرێتەوە! ئەمەیە، ئیتر، بەپێی کولتووری ئێمە: شەرعیەت دراوەتە مامۆستا و خەڵکی گەورە هەرچی بکەن ڕەوا و ڕاستە؛ شەرعیەتی دراوەتێ کە ئەو قسەکەر و قوتابیی گوێگر بێت! ئەم قانوون و نەریتە دەبێ وێران بکرێت.

ساڵانە هەزاران خوێندکار و گەنج شەهادەی بەکالۆریۆس وەردەگرن و نازانن چی بکەن؟ بێکار بێکار دەسووڕێنەوە. تەزکیەی حیزبییان بەئاسانی بۆ وەرناگیرێ، ئەگەر بشتوانن وەری بگرن دەبێ حیزب بڕیار بدات ئنجا! کە داشدەمەزرێن مووچەکەی شتێکی ئەوتۆ نیە کە بەشی ژیانێکی کولەمەرگییان بکات. بۆیە من گەلێک جاران خوێندکارەکانی خۆم دەبینمەوە لەسەر شەقامەکاندا پاقلە دەفرۆشن یان دەبینم: بوونەتە سایەق و تەکسییان هەیە! بەم شێوەیە زانکۆکان بوونەتە کارگەیەکی هەڵهێنانی خەریجی بێکار و بێ پارە و پووڵ!

جگە لەم گرفتەش هیچ هاوکاری و پێکەوەکارکردن و بەدەم یەکترەوەهاتنێک لەنێوان زانکۆکان و وەزارەتەکاندا نیە: هیچ وەزارەتێک یان دەزگایەک ڕاپۆرتی ساڵانەی خۆی بۆ سەرۆکایەتیی زانکۆکان ڕەوانە ناکات بڵێ (ئێمە لە فلان وەزارەتدا ساڵی داهاتوو ئەوەندە خەریجەی فلان کۆلێژمان پێویستە!).

لە گۆڤار و ڕۆژنامە خوێندکارییەکان و گەنجانەکاندا مانگانە چەندین ڕاپۆرت بڵاودەکرێنەوە لەسەر ئەوەی کە هیچ پرد و دیالۆگێک لەنێوان زانکۆ و بەستێنە جۆراوجۆرەک؛انی ژیاندا نیە.

گەلێک جارانیش شەهادەکە سوود و دەورێکی وەتۆی نابێ لە بەستێنی ژیانی عەمەلیی خوێندکاردا. من دەپرسم: ئایا سەدان تەڵەبەی خەریجی کشتوکاڵ چ دەورێکیان هەبووە لە بەرەوپێشەوەبردنی کشتوکاڵی کوردستاندا؟ ئایا جۆتیارێکی ئەو دەشتی هەورەمانە لە خەریجێکی کۆلێژی کشتوکاڵ بۆ کۆمەڵ سوودمەندتر نیە، خۆشگوزەرانتر و باشتریش ناژیت؟!

داخوازییەکی گرنگی دیکەی خوێندکاران زەماڵەی خوێندنە لە ئاستە جیاجیاکانی بەکالۆریۆس و ماجستێر و دکتۆرادا، کە تاکو ئێستا لەلایەکەوە ژمارەیان زۆر زۆر کەمە، ئەوەیش کە هەبووە بەردەوام قۆرخ کراوە بۆ خزم و کەسوکارەکانی سەرۆکایەتیی زانکۆ و کوڕە مەنسوولەکان.

دابینکردنی زەماڵەی خوێندن بۆ قوتابیان بۆئەوەی بتوانن بچن لە ئەورووپا خوێندنی خۆیان تەواو بکەن، ئەرکێکی سەرەکیی حکوومەت و وەزارەتەکان و سەرۆکایەتیی زانکۆکانە: لەپێناو نوێکردنەوەی زانکۆکانمان و بەگەڕخستنی گەنجەکانمان. تورکەکان هەر لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە، فارسەکانیش هەر لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی صەفەوییەوە دەرکیان بە گرنگیی ئەم مەسەلەیە کردبوو: هەر لە سەدەی هەژدەهەمەوە چەندین گەنج و خوێندکاری خۆیان ناردە ئەورووپا لەپێناو سوودوەرگرتن لە زانست و تەکنیک و بیری نوێ و ئەدەبیات و هونەری نوێ. حاجی قادری کۆیی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە ئاماژەی بەوە داوە کە ئێمەی کوردیش لەم ڕووەوە چاو لە میللەتانی فارس و تورک بکەین:

بۆ فەننی حەرب و سنعەت بۆ زەبط و ڕەبطی میللەت
دەینێرنە ئۆرووپا گەورە و بچووکی خۆیان

کەواتە، ڕاستە: بۆئەوەی زانکۆ ببێتە هی هەموومان؛ پێویستە هەر هەمووومان، خوێندکارانیش (نەک تەنیا مامۆستاکان) ئازاد بین لە بنیاتنانەوەیدا...

# وەسیەتێک
# بۆ خوێندکار و لاوانی سەرگەڤاز

**ئەی گەنجە سەرازاکانی ئەم نەوە تازەیەی کوردستانی فیدڕاڵ و دیموکرات!**
**ئەی قوتابی و خوێندکار و فێرخوازانی کوردستان!**

هەر مەسئوولێکی پیری کەر ئەگەر مرد، ئاهەنگێک ساز بدەن!
هەر شرە پرۆفیسۆر و
دکتۆرێکی کەترەی کەودەنی زانکۆ ئەگەر مرد؛
بڕۆنە سەرجادەکان و هەڵپەڕن!

هەر شاعیرێکی گەورەی زوڕناژەن و سەلەفی
هەر وەزیرێکی زەوقسز و پەرلەمانتارێکی نوستووی قۆتڕ
هەر دەڵەقۆڕ و دینگەیەکی عەقڵسزی کۆنەخواز
هەر مەلا و میر و مودیر و ڕەئیسێکی کەری کەچەڵ
هەر کۆنە بەعسی و عیراقچییەکی دیکەی نەسلی پێشوو...
ئەگەر مردن
خۆیان و نۆط الشجاعەکانیان
خۆیان و عەینەگە ڕزیوەکاکانیان
خۆیان و تەسبیحەکانیان
خۆیان و قافیەکانیان (کە دەڵێی زەنگوڵەی کەرن دەزرنگێنەوە)
لە گۆڕیان نێن و بە بەهەشتیان بسپێرن!

با بەهەشتی بەرین بۆ ئەوان بێت و ئەم دۆزەخە جوانەش بۆ ئێوە:
ئاوها، ژیانتان هەمووی دەبێتە ئاسوودەیی؛
داهاتووشتان مسۆگەر
ڕووناک ڕووناک
دەشەکێتەوە!

# ڕۆشنبیرانی سەر کاغەز
# و
# خوێندکارانی سەر شەقام

ڕۆشنبیر هەرگیز نابێ لە واقیع خۆش بێت، پێویستە بەردەوام بەکردەوە خۆی هەڵبقورتێنێتە ناو هەموو کاروبارێکی پەیوەندیداری ژیانەوە؛ کردەوەیەکی (ئەکشنێکی) ڕاستەوخۆی بەزەبری هەبێت!



من لە ٢٥/ ٢/ ٢٠٠٣دا کاتێ کۆبوونەوە و خۆپیشاندانی قوتابیانی زانکۆی سەلاحەدین و دوواتر خوپێشاندانی قوتابیانی زانکۆی سلێمانیم دیت دژی ئەگەری هاتنە ناوەوەی لەشکری تورکیا بۆ ناو کوردستانی عیراق، چەنێک دڵم خۆش داهات بەوەی کە «قوتابییەکانم» پێش «منی مامۆستایان»، پێش ڕۆشنبیرانیش، دەسپێشخەر بوونە؛ بەڵام ئەوەندە و زیاترش بەرامبەر بەم موفارەقەیە ئارەقەی شەرمەزاریم دەرکرد!

ئەمرۆ یەکگرتنەوەی هەر دوو ئیدارەکە و پێکهێنانی پەرلەمان و حکوومەتێکی یەکگرتوو، چیتر هەنجەتی ئەوە ناهێڵێ کە ڕۆشنبیران خۆیان لە هەڵوێست و ڕووداوەکان بدزنەوە و بچن لە پەراوێزی فەرمایشتەکانی حیزبدا خۆیان مات بکەن. لەوانەشە من بەم قسەیەم دیسان ئاسنی سارد بکوتمەوە. بەڵام هەر چۆنێک بێت و لە هەموو حاڵەتێکدا سەربژاردەیەکی مومتازی ڕۆشنبیران لە کوردستانی دووای ڕاپەڕیندا سەریان هەڵداوە، ئەگەرچی ژمارەیان بەزەحمەت لە ژمارەی پەنجەکانی دەست تێپەڕەکا بەڵام تەنیا ئەمانەشن کە توانیویانە چەمکێکمان لەبارەی (ڕۆشنبیر) بۆ دروست بکەن.

ئەم ڕۆشنبیرە سەربژاردانە، هەموویان لە دەرەوەی حیزبدا دەژین و دەجووڵێنەوە، هیچ دەزگا و ڕاگەیاندن و مێدیا و وەزارەتێک لەپشتەوەیان نین: بەڵام توانیویانە ڕەخنەگر، چالاک بن و ڕا دروست بکەن.

ئەم ڕۆشنبیرە سەربژادانە، ئەگەرچی بەردەوام ڕەخنەیان لە حکوومەت و ژیانی دووای ڕاپەڕین و سیستەمەکە گرتووە، بەڵام خودی خۆشیان بەری داری ئەو حکوومەت و ڕاپەڕین و سیستەمە نیمچە دیموکراتییەن کە لەدووای ڕاپەڕینەوە دامەزراوە (یان بەلای کەمییەوە خۆ دەتوانین بڵێین: پێش دامەزراندنی حکوومەت و ڕاپەڕین ١٩٩١، هەموو ئەمانە ناویان نەبووە و تەنیا لە ١٩٩١ بەملاوەیە کە وردە وردە سەرهەڵدەدەن). بۆیە دەتوانین بە نەسلی (ڕۆشنبیرانی ئازای ڕاپەڕین) ناوزەدیان بکەین: چونکە پێش ڕاپەڕین بوونیان بەم شێوەیە نەبووە، هەشبوونایە نەیاندەتوانی ئاوها ڕەخنەگر و جەسوورانە و ئاشکرا چالاکی بنوێنن. ڕاستییەکەیشی، ڕەگوڕیشەی خۆیان چەند لە ناوخۆوە پەیداکردووە، ئەوەندە و زیاتریش ڕەگوڕیشەی خۆیان لە فەلسەفەی هاوچەرخی ئەورووپییەوە وەدەستهێناوە، ئەمەش لەڕێگەی زمانەکانی فارسی و عەرەبی و لەپێش هەمووشیانەوە لەڕێگەی زمانە ئەورووپاییەکانەوە: سوێدی، دانمارکی، فەرەنسی، ئینگلیزی، ئەڵمانی، هۆڵەندی، ڕووسی...

سیمایەکی نێگەتیڤی ڕۆشنبیرانی ناوبراو لەوەدایە کە زیاد لە لزووم تیۆرین، تا بینە قاقا نوقمی نێو ڕۆشنبیریی هاوچەرخی عەرەب و فارس و ئەورووپان: نەهاتوون -بەبێ ناوهێنانی بەردەوام ئەم عارەب و فارس و ئەورووپاییانە- خودی خۆیان بیر بکەنەوە و لە خاسیەتەکانی تراژیدیای کۆمەڵگە و گرفتەکانی تاکی کورد ڕابمێنن. مەگەر تاک و تەرایەکیان نەبێت. بۆیە هەموویان، نە ئەوەن کە خودی خۆیان بن، نە ئەوەیشە کۆپیکراوی هیچ فەیلەسووف و ڕۆشنبیرێکی بێگانە بن. وەک کۆمەڵگەکەمان، نە دەزانین بتوانین خودی خۆمان بین نە دەشتوانین مۆدێلێکی دیاریکراو پەیڕەو بکەین.

من لەوە تێناگەم: ڕۆشنبیران بۆچی واتێدەگەن ئەگەر هاتوو بیریان کردەوە بەبێ ئەوەی کتێبێکی «جابیری» و «هابرماز» لەتەنیشتیان بێت، ئیتر لە بیرکردنەوە ڕادەوەستن و ناتوانن چیتر قەڵەمێک بە کاغەزدا بهێنن! بۆچی واتێدەگەن کە ناتوانن خودی خۆیان و خودی واقیعەکە و دیاردەکان و تراژیدیاکانی ژینگەی خۆیان وەقسە بهێنن!؟

ڕۆشنبیرانی ناوبراو بەرهەم و کاریگەرییەکی پۆزەتیڤیان هەبووە، بەڵام ڕۆڵی ئەمانە پێش هەموو شتێک ڕۆڵێکی ئەدەبیاتی و ڕۆژنامەگەرییانە بووە، نەچوونەتە ناوجەرگەی ڕووداوەکان و هێزێک دروست بکەن، فشارێک دروست بکەن. بۆیە لەم ڕووەوە، ئەگەر بەراوردیان بکەین بە بزاڤی خوێندکارانەوە، دەبینین (سەرەڕای ئەوەی کە بزاڤی قوتابیانیش هەر بزاڤێکی ئەدەبیاتی و ڕۆژنامەگەرییانەیە) بەڵام ئەوەی قوتابیان هێشتا زیندووتر بووە و توانیویانە هەندێک جار فشارێک بنوێنن بۆ سەر حکوومەت.

ڕۆشنبیرانی سەربژاردە و ئازای ڕاپەڕین، سەرەڕای جیاوازی و جەسارەت و سەربەخۆیی و یاخیگەراییان، ڕۆشنبیرانی سەر کاغەز بوونە. کار و ڕۆشنبیری و بەرهەمەکانیان تەنیا لەسەر کاغەز ماوەتەوە. ئەمەش نەک لەشێوەی بەیاننامە و ناڕەزاییننامە و یاداشتنامەیەک کە درابێتە حکوومەت لەپێناو ریفۆرم و گۆڕانکارییەکان - خۆزگە وا بووایە! بەڵکو لەشێوەی

بڵاوکردنەوەی کتێب و وتاردا کە تاقە ئامرازێک و تاقە بەستێنێکی چالاکییەکانیان بووە.

بەم تێبینییە مەبەستم هەڵبەتا کەمکردنەوەی نرخ و بەهای ئەو هەموو وتار و کتێبە گرنگ و جوانانەی ئەوان نیە، بەڵکو دەمەوێ ئاماژە بەوە بدەم کە لەپاڵ ئەو ڕۆشنبیرییە جیاواز و جەسوور و یاخیگەرەی سەر کاغەز، پێویست وایە کردەوە و ئەکشنێک هەبێت! کردەوە و ئەکشنێک لە ناوجەرگەی مەیدان و ڕووداوەکاندا: لە کوێ پێویست بوو لەوێ. چونکە، وەک ئەو ڕووناکبیرانە خۆیشیان زۆر جاران هێمای بۆ دەکەن: ژمارەیەکی زۆر لە وەزیر و پیر و پرۆفیسۆر و مودیر و میر و مەلا و مامۆستا و کاوێژکارەکان.. ناخوێننەوە و تەماشای «کاغەزان» ناکەن!

کەواتە، وەک دەرکەوتووە: سازکردنی خۆپیشاندانێکی چەند هەزاریی خەڵک، یان مانگرتنێک، یان هەر کردەوەیەکی بەزەبری دیکەی ببێتە هۆی گۆڕانکاری و ریفۆرم.. دەشێ هێزی هەموو ئەو کاغەز و کتێب و وتارانەیان هەبێت کە نەسلێکی ئازا نووسیونی!

بەڵام ئایا ڕۆشنبیر چۆن دەتوانێ خەڵک و خوێندکار کۆبکاتەوە، مانگرتن و خۆپیشاندانی چەند هەزاری.. ساز بدات؟ ئەمە لەکاتێکدا وەک گوتمان ژمارەی ئەو ڕۆشنبیرە ئازا و جەسوورانەی دەرەوەی حیزب، لە پەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکا؟

ئایا بچن ئەوانیش مەڵبەند و ڕابیطەیەکی ڕۆشنبیران دروست بکەن؟ نەخێر (هەموو دنیا و هەموو چین و توێژێک ئەمەی کردووە و یانەیەکی عارەقخواردنەوەی ئێوارانیشی بۆ خۆی لەناو ئەو ڕابیطە و مەڵبەندەدا دروست کردووە، بەڵام ڕۆشنبیرانی جەسوور و ئازا ئەمەیان نەکردووە، پێم وابێ ناشیکەن!). ئەدی چ بکەن؟

کاتی خۆی (لە ساڵی ١٩٩٣) لەناو کافتیریایەکی فڕۆکەخانەی ستۆکهۆڵم، ئەو دەمەی کاک ڕەفیق سابیری هاوڕێم، بەتەمای گەڕانەوەی یەکجاری بوو بەرەو کوردستان، بەدیار قاوەیەکەوە دانیشتبووین، پێم گوت:

- کاگ ڕەفیق، کە دەگەڕێیتەوە بۆ کوردستان، هەوڵی ئەوە بدە پۆستێکی وەزاری یان شوێنێکی گرنگی «بڕیاردان» بگریتە دەست.
- ئەمە ئەوەی دەوێت کە ببیت بە حیزبی!
- ئەگەر ناچاریان کردیت، ببێ!
گوتی: چۆن! بۆچی؟
- گوتم: چونکە ڕووناکبیرێکی ئەکتیڤی وەک تۆ، بۆ نموونە ئەگەر ببیتە وەزیری پەروەردە یان ڕۆشنبیری، ڕۆڵ و کاریگەریت لەپێناو ریفۆرم و کۆڕانکارییەکاندا بەزەبرتر دەبێت لەچاو حیزبییەکی نەخوێندەوار!
من دووای ڕابووردنی ئەوەندە ساڵە، هێشتا هەر پێم وایە: ڕووناکبیری ئازا چەند بتوانێ بگاتە ئەو پۆستانەی لەوێوە ریفۆرمی لەدەست دێتە بەر، باشترە.
لێرەدا حەزدەکەم نموونەیەک لەبارەی نەبوونی ئەو کردەوە و ئەکشنە لای ڕۆشنبیران و پەراوێزبوونیان لە ژیانی سیاسیدا بهێنمەوە و لەسەر پرسی پەرلەمان هەندێک ڕاوەستم:
لە فەرەنسا تەمەنت لە ۲۱ ساڵ زیاتر، لە ئەڵمانیا تەمەنت لە ۱۹ ساڵ زیاتر بێت ئنجا بۆت هەیە بچیت ببیتە ئەندام پەرلەمان.. بەڵام لە کوردستاندا هەر کەسێک تەمەنی لە ۳۰ ساڵ زیاتر نەبێت بۆی نیە ببێتە ئەندام پەرلەمان. لەوەش نایەکسانتر: پەرلەمانتاری پیر هیچ سنوورێکی بۆ دانەنراوە: تەمەنی پیرێک لە هەشتایشی تێپەڕاندبێ قانوون بۆی نیە هیچی پێ بڵێ! ئەمە بەتەواوەتی ئەوە دەردەخات کە قانوونیان بەشێوەیەکی وا داناوە کە کۆمەڵگە و حکوومەت دژی گەنج بێت و هاوزەوقی پیر بێت! دژی گەنجبوونەوە بێت و لەگەڵ مانەوەی نەریتی پیران و عەقڵی پیران بێت!
من دەزانم لەپێناو گۆڕینی ئەم قانوونە پیر و کۆنەبەعسیەدا، لەپێناو گەنجکردنەوەی پەرلەمان، لەپێناو ئەوەی کە گەنج و خوێندکاری زانکۆ بۆیان هەبێت لە تەمەنی ۲۱ ساڵییەوە لەناو پەرلەماندا ڕایان هەبێت و خوێنێکی نوێ بە گیانی کۆمەڵگە و پەرلەمان و حکوومەتدا بکەنەوە؛ ئەگەر تەنانەت من پێنج کتێب و چل و چار وتاریش بڵاوبکەمەوە، بەقەد

ئەوە کاریگەرێتی نانوێنێ کە خوێندکاری زانکۆ و خەڵکی گەنج و قوتابی بێن خۆپیشاندانێکی چەند هەزاری ڕێک بخەن یان مانگرتنێکی بەزەبر و فراوان ساز بدەن!

ئەم کارەش پێم وایە هیچ ڕێکخراوێکی گەنجان و قوتابیان و خوێندکاران و هیی تر ناوێرن بیکەن «بە ڕێکخراوی هاموونیشەوە» -ئەگەرچی سکرتێری گشتیی هەموو ئەو ڕێکخراوانە باوەڕیشیان پێی هەیە!- چونک هەرچی شتێک بە ئیعازی حیزب نەبێ ئەوان نایکەن!

کەواتە تەنیا ڕۆشنبیری سەربەخۆی ئازا (ئەمە جگە لە خوێندکارانی یاخیگەر و سەرازا) دەتوانن ئەم کارەیان لەدەست بێتە دەر.

پرسیاری من ئەمەیە: لە حاڵەتێکدا هەموو ئەو ڕووناکبیرە سەرازایانە لەسەر ئەوە کۆکن کە «پەرلەمانی ئەمڕۆی کوردستان پەرلەمانێکی پیر و حیزبی و شل و شۆق و چەپڵەلێدەرە و ناتوانێ هیچ ریفۆرمێک بکات!»، هەروەها لەسەر ئەوەش کۆکن کە ئەگەر هەر یەکێکیان پێنج کتێبی دیکە و چل و چار وتاری دیکەش بڵاوبکەنەوە، بەقەد ئەوە کاریگەرێتی نانوێنێ کە خوێندکاری زانکۆ و خەڵکی گەنج و قوتابیان خۆپیشاندانێکی چەند هەزاری ڕێک بخەن یان مانگرتنێکی بەزەبر و فراوان ساز بدەن؛ ئەدی کەواتە بۆچی ڕووناکبیرانی سەربەخۆ و سەرازای ئەمڕۆ لەم بارەیەوە هیچ کردەوەیەکیان نەبووە و بیریان لەوە نەکردۆتەوە هیچ هەنگاوێک هەڵبنێن؟!

لێرەدا، لەپێناو ئەوەی کە حزبەکان و پیرەکان چیتر نەتوانن بڕیار و ویست و ڕۆڵ و ئیرادە لە لاوان و خوێندکاران و ڕۆشنبیران بستێننەوە، هەروەها بۆئەوەی چیتر قوتابی و گەنج و ڕووناکبیر چارەنووسی خۆیان و گەلەکەیان نەسپێرنە دەست بڕیار و ویستی تەنیا مەکتەبی سیاسیی حیزبەکانەوە.. پێشنیاری ئەوە دەکەم کە هاوکاری و هاوقۆڵی و هاوهەنگاوییەک لەم بەستێنەی ژیانی داهاتوودا بێتە دی لەنێوان بزاڤی یاخیگەری خوێندکاران و ڕۆشنبیرانی سەرازای ئەمڕۆوە.

گەنج و قوتابییانی یاخی و ڕاپەڕیو، چونکە دەزانن، ئەگەر ئەم ڕۆشنبیرە مەرد و سەرازایانەیان لەپشت بێت، متمانەیان بە خۆیان زیاتر دەبێت؛ لە

هەمان کاتیشدا رووناکبیرە سەرازاکانیش دەزانن کە ئەو هەموو هێزە فراوانەی ئەم توێژە بێدار و یاخییە، هوشیاری و مەعریفەکەیان دەکاتە هێزێکی ماددی: ئاوات و خۆزگەکان بەڕاست دەگەڕێنێ و بەرەو ریفۆرم نزیکیان دەخاتەوە.

کەواتە، نە بزاڤی گەنج و خوێندکاران بەتەنیا، نە مۆدێرنیزمەکەی رۆشنبیرانی سەرازا، هیچ یەکێکیان بە تەنیا بالّی و بەتەنیا ناتوانێ ببێتە هێزێکی ماددی و وەدیهێن تا ئەوکاتەی هاوکاری و هاوپەیمانییەک لەنێوان ئەم دوو توێژە نەیەتە دی.

هەر دوو لا، هەر دوو توێژ، ماوەیەکی زۆرە لەسەر کاغەز، لەناو کتێب و رۆژنامە و کۆڤارەکاندا یان لەناو هۆڵ و باخچەی سەنتەرە رۆشنبیری و چایخانە و سەر شەقام و یانە و پۆلی کۆلێژەکاندا هەر هاوار دەکەن و رەخنە دەگرن و بۆڵەبۆڵیانە. دەبا ئەم جارە پشتی یەکتر بگرن و کردەوەیەکی هاوبیر و هاوپەیمانیان هەبێت.

پێش هەموو شتێک، پێویست وایە هەر لە ئێستاوە بە هەوڵ و نەخشەیەکی وردی هەر دوو لا، بتوانن فشارێکی خوێندکاری و گەنجانە و جەماوەریی بەهێز دروست بکەن بۆ سەر پەرلەمان و حکومەت کە ناچار بێت ئەو قانوونە لەکاربخات کە دەڵێ (ئەندام پەرلەمان پێویستە تەمەنی لە سەرووی ٣٠ سالّییەوە بێت!)؛ لە جێگەی ئەوە: هەر خوێندکار و گەنج و قوتابییەک لە تەمەنی ١٩- ٢١ سالّییەوە مافی ئەوەی هەبێت خۆی هەلّبژێرێت بۆ پەرلەمان!

ئەم قانوونە تازەیە، وەک رێگە خۆشکردنێک دەبێت بۆ داهاتوو، بۆئەوەی خوێندکار و لاوان بتوانن لە داهاتوودا لیستێکی گەنجانە و قوتابیانەی خۆیان هەبێت بۆ چوونە ناو پەرلەمانەوە.

لە قۆلێکی دیکەیشەوە دەکرێت رۆشنبیرانی سەربەخۆ و سەرازا بە هاوپەیمانیی خوێندکار و گەنجانی رۆشنبیر و یاخی بێن لیستێکی رۆشنبیران دروست بکەن: بۆئەوەی بتوانن قورسایی هێزی چەپ و مۆدێرن لە پەرلەمانی داهاتوودا زیاتر و کاریگەرتر بکەن!

لەوەتەی پەرلەمانی کوردستان هەبووە، هەمیشە لیستی حیزب دەستڕۆکانی ناو پەرلەمان بوونە. ئەسڵەن لەناو پەرلەماندا تەنیا لیستی حیزب هەبووە، لیستیِ فیکر نەبووە. حیزب هەبووە، بیرکردنەوە نەبووە. بەم شێوەیە، لەو کاتە بەملاوە کە لیستی ڕۆشنبیران و قوتابییان دەگاتە پەرلەمان، وای لێ دێت لیستی فیکر بکەوێتە ناو پەرلەمانەوە: بیرکردنەوەیەک، گفتوگۆیەک، کردەوەیەک، چەند قانوونێکی هاوچەرخ و بەسوود سەوز بێن !

هەبوونی لیستێکی تەبای ئەوەی خوێندکاران و گەنج و ڕۆشنبیرانی سەربەخۆیش، بێگومان لە بەرژەوەندیی هێزە ناسیوونالیست و چەپەکان دەبێت، لە هەمان کاتدا شتێکیش لە قورسایی و هێزە پیر و کۆنەبەعسی و سەرۆک عەشیرەت و کۆنەخوازەکانیش کەم دەکاتەوە.



ئینسان ئەگەر، لە نەوجەوانییەوە، بەهرەی ئەوەی لەلا پەروەردە نەکرێت کە بەرامبەر هەموو شتێکی هەیە ناڕازی بێت، هەرگیز ناگاتە دۆزینەوەی شتە نوێکان...



لە کاتی نووسینی ئەم کتێبەدا، چەند ڕستە و بیرۆکەیەکی دیکەم هەبوون حەزم دەکرد شیتەڵیان بکەمەوە و بەناو دیاردە و واقیع و ڕووداوەکانیاندا بگێڕم و بەڕاستیان بسەلمێنم، بەڵام لەڕێگەدا، هەمووم لێ بەربوونەوە. لێرەدا تاک تاک دەیانخەمە پێش چاو لەگەڵ دووپات کردنەوەی هەندێ ڕستەی دیکەی کە جەختییان لەسەر دەکرێتەوە:

کورد دەبێ بتوانێ بڵێت «من هێزێکی دارایی و مەزنی ئابووریم هەیە»، ئنجا دەتوانێ بڵێت «کەواتە، من هەم». دروستبوونی ئەم شەخسیەتە مەزنە دارایی و هێزە سەرمایەدارییە کوردییە گەورەیەش، بێگومان، بە بووژاندنەوەی بەرهەمهێنانی ناوخۆ و کشتوکاڵ و پیشەسازییە نەتەوەییەکان دێتە دی،

کۆمەڵگە بەردەوام باس دەکرێت، کەچی تاکەکەس فەرامۆش کراوە..

ئەم نەسلە نوێیەی خاوەن گرفتە کۆمەڵایەتی و پیشەیی و سیاسیەکان (بەپێچەوانەی نەسلی ڕابردوو) لە ژیانی تاکەکەسیانەوە نزیکترن.

تاکەکەس نابێت بە هێزە مێژوویی و سیاسی و دینی و عەشیرەتگەرییەکان بەڕێوە بچێت. ئەوەتا ئێمەش ئەمڕۆ خەریکە بێدار دەبینەوە و خۆمان لە هێزە مێژوویی و سیاسی و دینی و عەشیرەتگەرییەکان ڕادەپسکێنین..

کۆمەڵگە واتە وەدیهێنانی ئامانجەکانی تاکەکەس.

شار واتە هاوڵاتی

تاکەکەسی ئەمڕۆی ئەورووپی هەموو ئەو شتانەی هەیە کە حەزی لێدەکا، ئازادیش. ئەو شتانەی هەینی کیفایەتە بۆی. چیتر پێویستی بە هیچ نیە،

هێنده پێویستی به داهاتوو یان به خەون و خۆزگە و یاخیبوون نەماوە. (ماچکردنێکی خۆشەویستەکەت لەسەر شەقام بۆ نموونە لە ئەورووپا هیچ ڕەهەندێک و یاخیبوونێک و ئازادییەکی ناوێ).. بەڵام ئازادی لە کوردستاندا، بەپێچەوانەی ئازادی لە ئەورووپادا، واتا و ڕەهەندی زۆر و جۆراوجۆری هەیە: دژی کۆمەڵ، دژی نەریتەکان، دژی سیاسەتی باو، دژی ئەخلاقی زیانبەخش، دژی دین.. ئەمە لەکاتێکدا لە ئەورووپا ئازادی تەنیا بۆ خۆیەتی و لەناو خۆیدایەتی و بەس.

موراهیقێکی ئەڵمانی یان فەرەنسی، بە خۆی و تەنیا (١٥٠٠) دۆلارەوە دێ دەتوانێ کۆبوونەوە بە وەزیرمان بکات، بەڵام گەنجێکی ڕووناکبیری خۆمان یان قوتابیەکی ڕۆشنبیری یاخیی دڵسۆزی نەتەوە ناتوانێ تەنانەت بگاتە ئیستیعلاماتەکەیشی..

لەئەنجامی بێداربوونەوە و یاخیبوونەکانی خۆماندا، هەروەها لەئەنجامی مومارەسەکردنی ماف و ئازادییەکانماندا، ئێمەی گەنج و قوتابی، پێویستە جۆراوجۆرێتییەکی ئەوتۆ لە فۆرمی دەربڕینی تاکەکەسیانەدا بهێنینە ئارا کە بەقەد جۆراوجۆرێتیی فۆرمە زەبروزەنگاوییە کۆمەڵگەراکان جۆراوجۆر بن.

یاخیبوون دژی کاریگەرێتی و توخمە سروشتییەکانی کۆمەڵگە زۆر زەحمەتترە بۆ تاکەکەس لەچاو یاخیبوون دژی کۆمەڵگەکە لەشێوەی ڕێکخراوە ئیدارییەکانی خۆیدا، یان دژی دەوڵەت.

یاخیبوونێکی ڕادیکاڵ دژی کۆمەڵگە ئۆتۆمکاتیکی دەبێتە یاخیبوون دژی سروشت

کەواتە، ئێمە، دەبێ لە هەمان کاتدا دژی (سروشتی شتەکان) یاخی ببین: قانوونی گەشەپێسەندنی ڕۆحیانە بەسەر شتەکاندا فەرز بکەین.

گەنج لە ماوەی ژیانی زانکۆییدا مافی ئەوەی هەیە کە قەرز لە حکوومەت وەربگرێت. لە هەمان کاتیشدا مانگانە دەرماڵەیەکی هێندە زۆر وەردەگرێ کە مننەتی بە باوک نامێنێت و چاوی لە باخەڵی باوک نابێت. ئەم قانوونە وادەکات کە کوڕ بەتەواوەتی ئازاد بێت و شەخسیەتێکی «خۆبەکەم زان» و لاوازی نەبێت: هەر کاتێک بیەوێت، بتوانێ سەفەربکات و دەعوەتی خۆشەویستەکەی بکات و کتێب و پێداویستییەکانی دیکەی بکڕێت و بەکورتی: ئاسوودە و ئازاد بژیت..
– کەواتە سیاسەتی ئابووریی حکوومەتی ئێمە لەهەمبەر گەنج و قوتابیانەوە سیاسەتێکی ئابووریی هەڵەیە!

دەرچوون لە چوارچێوەی فەرمایشتەکانی میر و مەلا و مامۆستا بریتی بووە لە دەرچوون لە چوارچێوەی فەرمایشتەکانی خوا و دین و مزگەوت.

تاکو ئەمڕۆ بیری «کوردایەتی» و ناسیونالیزمە کە ڕێبەرایەتیی گەنج و خوێندکاری کوردستان دەکا؛ لەمەش خراپتر بیری ململانێی حیزبایەتییە کە بزاڤی لاوان و قوتابیان لە وڵاتی ئێمەدا ڕێبەری دەکات. هەر ئەمەیشە ئەو جیاوازییەی لەنێوان بزاڤی خوێندکارانەی ئەورووپا و کوردستاندا هەیە.

من نەک ئەگەر مودیری دەزگای ڕاگەیاندنی حیزبێکی خەباتگێڕی وەک پارتی دیموکراتی کوردستان بم، نەک ئەگەر سکرتێری گشتیی ڕاگەیاندنی یەکیەتیی نیشتیمانیی کوردستان بم، تەنانەت ئەگەر حەمامچییەکی فەلەی نەخوێندەوار یان کوورەچییەکی تورکمانیش بم (لەکاتێکدا ئەگەر دڵنیا بم سەرتاپای میللەتی کورد دەیەوێت لە عیراق جودا بێتەوە) بەڕاستی لەڕووم نایەت و نایەم (بە پارە و پووڵی خۆشم و میللەتەکەشم) زوڕنا بۆ عیراقچێتی و «دەوڵەتی عیراقی ئیبراهیم جەعفەری» لێ بدەم و سروودی «موطنی، موطني..» لە سەتەلایتی کوردستان تی ڤی و کوردساتدا بەردەوام بەردەوام لێ بدەمەوە!

سەدەکانی ڕابردووی کوردستان هیچ هوشیارییەکیان لەبارەی خۆیانەوە بەرهەم نەهێناوە، بەڵام (ئەمڕۆ) بەوە دەناسرێتەوە کە هوشیارییەکی تێر و پڕ، تەنانەت پڕ وردەکاری، لەبارەی سەردەمی خۆیەوە بەرهەم دەهێنێت.

بزاڤی قوتابیان و لاوانی ئەمڕۆی کوردستانی عیراق، تەنیا لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی خوێندکاران دەسوورێتەوە و خۆیان نادەن لە قەرەی گرفتەکانی غەیری خۆیان؛ لەمەش بەدبەختانەتر کار زیاتر لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی قوتابیانی سەر بە یەک حزب دەکەن. ئەمەش نەنگترین و خراپترین خاسیەتە.

لە سۆنگەی ئەوەی کە حیزب بیرکردنەوەی تاکەکەسیانە و بیرکردنەوە لە یاخیبوون دەکوژێت، کەواتە مانای وایە بیرکردنەوەش نامێنێت (تەنانەت لەناو پەرلەمانیشدا). یاخیبوون -کە جەوهەری پێشکەوتنی تاکەکەسە- لەبەین دەڕوات و نامێنێ؛

ئەمەش مانای وایە کە ئێمە، لەمێژووی خۆماندا، دەبین بە سەردەمێکی بێ یادەوەری؛ سەردەمێک کە هیچ پێشبینی و مومکیناتێکی لێوە لەدایک نابێ.

یاخیبوون- هەمووومان دەزانین- لەوکاتەدا دەست پێدەکات کە «من» بیری کردەوە.

کاتێ تۆ دەوێریت یاخی ببیت، کاتێ تۆ دەوێریت بەپێچەوانەی حکوومەت و ژینگە و حزب و دام و دەزگا و میر و مودی و مەلا و مامۆستاکەت و سەرۆک بەشەکەت بیربکەیتەوە، کاتێ تۆ دەوێریت بەپێچەوانەی گەورەکانت و کۆمەڵەکەت، خۆت بیت؛ ئیتر ئەم وێرانە جێژووانی بووژاندنەوەی هەموو توانا و بەهرە و یاخیبوون و ئازادییەکانتە!

یاخیبوون ڕەهەندێکی فیزیایی هەیە. منداڵ یان نەوجەوان ئەگەر یاخی نەبێت، ئەوا ناتوانێ سەربەخۆ و داهێن بێت، ناتوانێ تەنانەت گەورەش ببێت. کەواتە، هەر کۆمەڵگەیەک ئەگەر کۆن و پیرانە بیربکاتەوە و سانسۆر بخاتە ئەم یاخیبوونانە، ئەوا مردنی خۆی ئامادە دەکات.

کەواتە، گەنج، هەروەها قوتابی و نەوجەوان، هەر بە فیزیک، واتە بە سروشتی خۆیان یاخیگەرن، لەسەر چزن..

یاخیبوون بە ناو زمانیشدا دەڕوا (ئەسڵەن پێویستە بەناو زمانیشدا بڕوات!).
کەواتە، گەنجی یاخی، یان قوتابیی ڕاپەڕیو چاک دەکات کە زمانێکی پیس و ناشیرین بەکاردەهێنێت: چونکە تەنیا وشەیان هەیە بۆ شۆڕش، تەنیا زمانیان هەیە بۆ دەربڕن.

بەکارهێنانی وشەی ناشیرین و قسەی قۆڕ و جنێو مافێکی ڕەوای خوێندکاری یاخی و گەنجی تووڕەی ڕاپەڕیوە، چونکە بەکارهێنانیَ ئەم چەکە هەوڵدانێکە بۆ ڕووخاندنی ئیمازی «دەسەڵات»، هەوڵدانێکە بۆ تێکدانی بیری «پیرۆزی»ی دوژمن کە کۆمەڵگەی پیر پێی بەخشیوە.

گەنجی یاخی، یان قوتابیی ڕاپەڕیو لە کاتی یاخیبووندا ناتوانێ بە سەرۆکی دەزگایەک کە کۆنە بەعسی بووە و ئەمڕۆ زوڵم لە گەنج و تەڵەبە دەکات ناوی بێنێت بە (جەنابی سەرۆکی فلان دەزگا) بەڵکو بێگومان دەڵێ (کۆنە هینەکە!).. هەروەها ناتوانێ بۆ ناوهێنانی مەسئولێکی پیری زاڵمی فلان شوێن بڵێت (جەنابی فلان..) بەڵکو دەڵێ (زرتە بۆزەکەی کۆلیژی..) یان (دزەکەی فلان شوێن..)..

دەستە و گرووپە گەنجانە و خوێندکاری و ڕۆشنبیرییەکانی دەرەوەی حیزب و ڕێکخراوەکان، کە ژمارەیان زۆر کەمیشە، ڕۆڵی گرنگ و پلەی یەکەمیان

هەبووە و هەیە لە لەیەکترکۆکردنەوە و پێکهێنانی «ئەو هێزە یاخی و ڕاپەڕیوەی کە بونیادەکەی بریتیە لە تاکەکەسە بێدار و ڕاپەڕیوەکان»..

ئەکشنێکی سیاسی وردە وردە خەریکە دروست دەبێ لەئاکامی داخوازییەکانی تاکەکەس. نەک لەئاکامی داخوازییەکانی سەندیکا و ڕێکخراوەکان..

بیری ئازادیی تاکەکەسیانە خەریکە وردە وردە سەرهەڵدەدات و بەبێش خەڵک دەکەوێ، لەجیاتی حیزب و باوک و مامۆستا و میر و مەلا و مودیر، دەبێتە ڕێبەر.

کەواتە حکومەت پێویستە هەتا زووترە ریفۆرم بکات:

لە کاتی تووڕەبوون و سەرهەڵداندا، یا لە کاتی یاخیبووندا هیچ خوێندکارێک بیر لەوە ناکاتەوە ئاخۆ باو و باپیرەکانی کێ بوونە؟
لە کاتی بێزاری و مانگرتندا، واتە لە کاتی ڕاپەڕیندا هیچ قوتابییەک پێویستی بەوە نامێنێ بزانێ ئاخۆ سەر بە کام عەشیرەت و حیزبە!
لە کاتی دارژانە ناو جادە و یاخیبووندا، واتە لە کاتی ڕاپەڕیندا هیچ گەنجێک پێویستی بەوە نامێنێ بپرسێ ئاخۆ حکوومەت و زانکۆ و دەزگاکانی دیکە بەو ڕاپەڕینەی ئەو دڵخۆشن یان سەغڵەت دەبن؟!

# ئالان

۱۸٦۸ - ۱۹٥۱

ئێمیل شاغتیێ، ناسراو بە ئالان، فەیلەسووفێکی ناوداری فەرەنسییە، ماوەیەک مامۆستا بوو لە یەکێک لە قوتابخانەکانی دەوروبەری پاریس، پاشان لەزانکۆ، وەک مامۆستای وانەی فەلسەفە کاریگەرییەکی زۆری نواند بەسەر قوتابییانی زانکۆکانی پاریس؛ وای لێکردن بەو ئاڕاستەیەدا بڕۆن کە «گرنگ نییە بیر لە چی دەکەیتەوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە چۆن بیردەکەیتەوە».

لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (۱۹۱٤ - ۱۹۱۸) بە نووسین و چالاکییەکانی دەورێکی ئاشتیخوازانەی گێڕا. ئەو دژی جەنگ بوو، دەیگوت «جەنگ خراپەکارییەکی موتڵەقە. تۆ پێویستە هەندێ جار تەنازول بکەیت لە پێناو ئەوەی بگەیتە ئاسایش».

ناودارترین بەرهەمەکانی ئەمانەن: بیر و تەمەنەکان (۱۹۲۷)، خواوەندەکان (۱۹۳۷)، جەربەزەییەکانی دڵ (۱۹٤٥)؛ بەڵام لە هەموویشی گرنگتر ئەو تیکە نووسراوانەن کە لە ساڵی (۱۹۰٦) بەملاوە دەستی پێکردبوو بیانووسێ تا ساڵی ۱۹٥۱: بەشێوەیەکی ڕۆژانە و ڕۆژنامەنووسانە، بەڵام بەشێوەیەکی قووڵ و وردبین، بەناونیشانی

(بۆچوونەکان)، فەلسەفەی تایبەت و تاکڕەوانەی ڕەسەنی خۆی دارشتبوو.

ئەم کتێبە ناودارەی Propos لە چەند بەشێک پێکهاتووە: ئەو توخمانەی دۆکترینی ڕادیکاڵ پێک دەهێنن (١٩٢٥)، هاوڵاتی دژ بەدەسەڵات (١٩٢٦)، بۆچوون لە بارەی سیاسەت (١٩٣٤).

ئالان، فەیلەسووفێکی ڕادیکاڵ و بەرگریکاری بنەماکانی فەلسەفەی تاک باوەڕی، دژی هەموو دەسەڵات و تۆتالیتارێک بوو کە بیەوێ هاولاتی و تاکەکەس و ئازادییەکانیان بخاتە ژێر فشار و نێڵ و زەبر و زەنگەوە. هەر ئەمەش بوو سیحری ئەوەی کە توێژی تەڵەبە و گەنج لێی کۆ دەبوونەوە و دەیانخوێندەوە و شێتی بۆچوونەکانی بوون. زۆربەی بیریار و سەرکردەکانی سەدەی بیستەمی فەرەنسا لە سەر دەستی ئەو وانەی دیموکراسییان وەرگرتووە.

لێرەدا تەنیا چەند پەیڤێک لە نووسراوەکانی ئەم فەیلەسووفە لە بارەی بەهاکانی تاکەکەس و پەیوەندییەکانی دەسەڵات... دەخەینەڕوو:

مانای ئەوە چییە کە ڕووناکبیر لە سیاسەت تێ بگا؟ مانای ئەوە چییە کە لە سیاسەت تێ بگەی؟

ئالان لە وەڵامدا دەڵێ: «تێگەیشتنمان لە سیاسەت پێش هەموو شتێک مانای ئەوەیە لەو کاریگەری وکاردانەوانە تێ بگەین کە لەنێوان دەسەڵات و تاکە کەس حوکمکراوەکاندا ڕوو دەدات».

کەواتە چەمکی «ئێمە» لە فەلسەفەی ئالان دا، وەک شاعیر لە کۆمارەکەی ئەفلاتۆن دا، بوونی نییە، چونکە بەبۆچوونی ئالان هەر بیرکردنەوەیەک لە ڕێگای خەڵک و «ئێمە»وە بێت و گرووپ ئەنجامی بدات؛ لە سیاسەتی ئالان دا بریتییە لە گەمژەیی و بەربەرییەت. ئالان لەم بارەیەوە دەڵێ: «هەر کاتێ خەڵک پێکەوە بیریان کردەوە، یەکسەر کارەکان تێک دەچن».

ئالان، بەم شێوەیە پێی وایە کە هیچ شتێک لە سیاسەتی کۆمەڵ شەڕەنگێزتر نییە. سیاسەتی فەیلەسووف بریتییە لە سیاسەتی تاک؛ چونکە لای ئالان، کۆمەڵ هەمیشە بریتییە لە داڕووخاندن و سەرکوتکردن. کۆمەڵ هەمیشە کوێرە، شەڕ و کۆیلە بوون و فیتنە بەرهەم دێنێت.

بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، ئالان دەڵێ: «مرۆڤایەتی بەردەوام خۆی لە تاکەکەسیدا دەدۆزێتەوە» ، «هەر بۆیەش تاک هەمیشە دژی کۆمەڵ بیر دەکاتەوە» .

بەم شێوەیە، بەبۆچوونی ئالان ڕووناکبیر بوون واتای ئەوە دەگەیەنێ کە لە سیاسەت تێ بگات. لە سیاسەت تێگەیشتنیش واتای ئەوەیە کە بگەڕێیتەوە بۆ تاک و بەهاکانی تاکەکەی، بۆ مرۆڤ.

ئالان دەڵێ: هەموو سیاسەتمەدارێک ئارەزووی فراوانکردنی پرۆژەکانی خۆی هەیە، هەموو بەڕێوەبەرێکی پۆلیس حەز لە ڕێکوپێکی و نیزام دەکات، هەموو فەرمانبەرێک ئارەزووی فراوانکردنی مافی خۆی هەیە لە چاودێری و ئیمتیازەکانی خۆی... ئیدی بەم شێوەی یەکسەر دەوڵەتێکی فەرمانڕەوا پێکدێت کە ڕێسا و پێڕەوی خۆی هەیە و لە پێناو مەزنیی تایبەتی خۆیدا حوکم دەکات. بەکورتی بەکارهێنانی دەسەڵات بریتییە لە بەرهەمی سروشتییانەی خودی دەسەڵات. دەسەڵات چی یە؟

ئالان دەڵێ: دەسەڵات بریتییە لە گرووپ، ئۆفیس، سەرکردە، بریتییە لە ڕای هاوبەش. بریتی نییە لە ڕای تاکەکەسێکی دیاریکراو، بریتییە لە هیچ، لە ئامار، بریتییە لە دادپەروەری، نیزام، دیسپلین؛ لاسایی کردنەوەی هەمووانە بۆ هەمووان، گیانی سەرکردایەتی و گوێڕایەڵی کوێرانەیە؛ ئەو پەیوەندییە دەرەکییەیە کە مرۆڤ دەکات بەشت. بریتییە لەچاودێری باڵا.

بەکورتی دەسەڵات بریتییە لەوەی کە تاکەکەس سەرکوت دەکات. لە ڕووی سیاسیشەوە بریتییە لە دەوڵەت و جەماوەر و بەیەکەوە، ئەو جەماوەرەی کە لە ڕێگەی پیرۆزییەکانەوە خۆی دەوڵەت دروست دەکات. دەسەڵات بریتییە لە ئارەزووی گرووپ و خەڵک، بریتییە لەو دەسەڵاتەی کە تاکەکەسەکان دەیبەخشن بەگرووپێک و ئەویش لێیان هەڵدەگەڕێنێتەوە.

ئالان دەڵێ: شەڕ و جەنگەکانیش بریتییە لە ڕووە ناشیرینەکەی ناماقوولییەتی دەسەڵات.

گەیشتنی بۆ دەربازبوون لە هێزی دەسەڵات و بەئاوات گەیشتنی مرۆڤ، بەبۆچوونی ئالان، پێویستە یەکەم جار سیاسەتی هاوڵاتی دژی دەسەڵات دابمەزرێنین: هاوڵاتیی تاکەکەس بەرامبەر دەسەڵاتی سەربازی و سیاسی لە

یەک کاتدا و دژی هەموو دەسەڵاتەکان. دووەم شتیش کە پێویستە تێکی بشکێنین بریتییە لە وەهمی دەسەڵات لە بارەی خۆی؛ خەونەکانی دەسەڵاتداران پووچ بکەینەوە.

گەنجەکان و قوتابییانی ڕاپەڕینی فەرەنسای مایسی (١٩٦٨)، چەند فەیلەسووفێکی وەک ئالانیان خوێندبۆوە؛ بۆیە بوێرانە هاتن لە سەر دیوارەکانیان نووسی: (ئەی دەسەڵاتداران! ئەی ئوستادەکان، پیر بوونی ئێوە تەریبە لەگەڵ پیر بوونی ڕووناکبیرەکان؛ مۆدێرنیزمی ئێوە جگە لە نوێکردنەوەی پۆلیسەکانتان شتێکی تر نییە).

سەرچاوە: سەرجەم بەرهەمەکانی ئالان، چاپی گالیمارد، پاریس. بە فەرەنسی.

# وەفاتنامەیەک
# بەبۆنەی تێپەڕبوونی (٤٠) ساڵ
# بەسەر ڕۆژی لەدایکبوونم



من (د. فەرهاد پیرباڵ) ئەمرۆ: ٢٠٠١/٨/٢٠، کە خاوەن تەواوی عەقڵی خۆمم، ئەم وەفاتنامەیەی خۆم بڵاودەکەمەوە:

من لەمرۆ بەملاوە، ڕایدەگەیەنم کە هیچ ڕەوایی و مافێکم لە تازەگەری و نوێکردنەوەدا نەماوە. هەر بەرهەمێکم، ئەگەر ئیمزای پێش ٢٠٠١/٨/٢٠ی بەسەرەوە نەبێت؛ پێویست وایە نووسەر و خوێنەران (بەتایبەتی خەڵکی گەنج) بە گومان و بێزەوە تەماشای بکەن؛ متمانەی پێ نەکەن؛ هیچ بایەخ و بەهایەکی بۆ دانەنێن؛ بە چاوی سووکەوە سەیری بکەن؛ بە قسەی قۆڕ و وڕێنەیان لە قەڵەم بدەن؛ تەنانەت پێویست و باشتریش وایە دەم و دەست فڕێی بدەنە زبڵخانەوە. ئەمەش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- نووسەر یان هونەرمەند لە تەمەنی (٤٠) ساڵ بەرەو سەرەوە، هەمیشە - یان بەلای کەمییەوە زۆربەی کات- وردە وردە هیچی پێ نامێنێ. « بڕوانە مانیفێستی دووەمی وێران، دیوانی ڕەشاییەکانی ناو سپی و سپیاییەکانی ناو ڕەش، ل ٣- ٧».

٢- لە سۆنگەی دەوام و بیرۆکراتیەت و ڕۆتین، هەروەها لە سۆنگەی ژیانی خۆی لەگەڵ ژن و منداڵەکانی، لەم تەمەنە بەرەو سەرەوە، ئیتر وردە وردە ڕۆحی داهێنان و تازەکردنەوە لەناویدا کەمتر و کزتر دەبێتەوە؛ لە کۆتاییدا دەکوژێتەوە.

٣- لەبەر ئەوەی، زۆربەی جاران، ناچار دەبێت موجامەلەی حکوومەت یان حزبی باڵادەست یان بەرپرسەکانی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن بکات، یان تەنانەت لە ترسی مودیری دائیرەکەی؛ ناچار دەبێت کە بۆیان دا... بهێنێت؛ تەسلیمی بڕیار و پلانەکانی ئەوان دەبێت؛ بۆیە ئیتر هێزی سەرشێتی و یاخیبوون و بڕستی ڕووبەڕووبوونەوەی، کەمتر دەبێتەوە؛ یان هەر بەیەکجاری چۆک دەدات.

٤- نووسەر یان هونەرمەند لە تەمەنی (٤٠) ساڵ بەرەو سەرەوە، زۆر ڕێی تێدەچێت تووشی «خرفان» و «کەرێتی» و «داء العظمە» و «حەسسوودی» و «شیزۆفرینیا».. ببێت.

من بەش بە حاڵی خۆم، ئەم دوو خاڵەی سەرەوەم - لەڕێگەی وەزیفەکەمەوە، کە زانکۆیە - زۆر بەئاشکرایی بۆ سەلماوە: وەزیفە و ئاواتی تەرقیەکردن، ماڵ و منداڵ بەخێوکردن، چاوبڕینە پایە و کورسی و پارەی موحازەڕات و پارەی ئیشراف کردنە سەر نامە زانکۆییەکانی قوتابییانی ماجستێر و دکتۆرا (کە ئەمڕۆ باشترین و ئاسانترین بازرگانییە بە شەرەفی ئەدەبیات و قوتابییانی بەستەزمان دەکرێ).. هەموو ئەمانە لە ڕاستەشەقامی داهێناندا سەرچیغت دەبەن؛ بە ناوی «ناچاری» و «ئەکادیمیەت» و ڕەسمیات و ئیدارەوە، دەتخەنە ناو چڵکاوێکی بۆینباغ نارنجییەوە.

کەواتە، ناکرێ نووسەرێک کە داهێنانەکانی خۆی لە تەمەنی پێش (٤٠)ساڵیدا کردووە، یان نووسەرێک کە لە دەرەوەی زانکۆ و دائیرەکانی

دیکەوە بۆتە نێرگز؛ تا هەتایە، هەر لەسەر عەرشی «داهێنانەکانی» چل ساڵی ڕابردووی خۆی بژیت؛ یان لەسەر حیسابی ئەوە سنگی خۆی بێنێتە پێشەوە کە دکتۆرا و پرۆفیسۆرێتیی لە «سۆربۆن» یان لە «ڕووسیا» وەدەستهێناوە. پێوەرێکی ئێستەتیکی، لە دەرەوەی هەموو ئەم دائیرە و دەزگا و زانکۆ و شتە قۆڕانەوە هەیە، وەک منداڵێکی خۆشەویستی وڕگگر ناچارمان دەکا باوەڕی پێ بێنین...

ئیتر بە ڕاشکاوییەوە دەڵێم:

من لەمڕۆ بەملاوە (بەداخەوە بۆ خۆم و بۆ ئەو کەمبەیەی خۆشی دەوێم) چی بکەم: وردە وردە دەچمە ڕیزی پەککەوتە و پیر و سەلەفی و کۆنەخواز و بیرۆکرات و هیچ پێ نەماوەکانی وەکو .......... هەزارانی دیکە!

بەداخەوە بۆ ئەوانەی بەرهەمەکانی منیان لەلا جوان بووە: وردە وردە دەچمە خانەی ئەو نووسەر و هونەرمەندانەی کە خڵەفاون یان تووشی داء العظمە و کەرێتی و حەسسوودی و تەمبەڵی و خۆبەزلزانی هاتوون؛ واتێدەگەن کە جیهانی ئەدەب و هونەر تا هەتایە هەر پێویستە لەژێر دەست و پێی ئەواندا و بە دڵی ئەوان بەڕێوە بڕوات!

من ئەمڕۆ دەچمە ڕیزی هەموو ئیعلامی و سەرنووسەر و ئەکادییە پیرەکانەوە؛ ئەوانەی بەدرێژایی ژیانم گاڵتەیان بە هێرۆ هەترەشچووە عەنتیکەکانی سەر دەستم دەکرد، بێزیان لەوە دەکردەوە کە قەرەوێت نابەستم و گۆرەوی لەپێ ناکەم و لەبەر مودیرەکانیان هەڵناستمەوە؛ کاتێ دەشیانبینیم دەیانگوت: (ها، شێتۆکە؟ هیچت نیە ڕەفزی بکەینەوە؟).

دەچمە ڕیزی ئەو پیرە سەگانەی، کە هەمیشە، لە ژیانی نەوجەوانی و ڕابردووی پڕ لە سەرکێشیی خۆمدا، پێم دەوەڕین!

کەواتە، چیتر لەمەودووا هیچ کەسێک (بەتایبەتی خەڵکی گەنج) بەوە فریو نەخوات: من مادام دکتۆرم، من مادام مامۆستای زانکۆم، من مادام دە دووازدە کتێبێکی قۆڕم چاپ کردووە؛ کەواتە ئیتر هەرچی شتێکی من و ئەمسالی وەکو من دەیاننووسین؛ جوان و دروست و ڕاستن! بە پێچەوانەوە، ئەو بەرهەمانەی کە من و ئەمسالی وەکو من - ئەگەر لە چل ساڵی بەرەو

سەرەوە دەیاننووسین - چاوەڕێی ئەوە بکەن بریتی بن لە پیسترین ژەهر، کۆسپ و چالێکی ملشکێن، لەبەردەم پێشکەوتنی ئێوەی گەنج و خوێندکار و نەوجەواندا.

ئەمەی من دەیڵێم، باوەڕ بکەن: خاکەڕایی نیە، بەڵکو جەختکردنەوەیەکی گرنگە لەسەر پێویست بوونی بوار بەجێ هێشتن بۆ خەڵکی گەنج و قوتابی؛ هەروەها ماف و ڕەوایی بەخشین بە بەهرە و توانای نەوجەوانەکان بۆئەوەی باوەڕ بە خۆیان پەیدا بکەن و بتوانن لە «جغزەکەی ئەولیا چەلەبی» دەربازیان ببێت؛ هەروەها جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی کە ئینسانی پیر ئیتر پێویستە لەمەودووا هیچ ئیعتیبار و بایەخێکی بۆ دانەنرێت؛ تۆپی پێوە بنرێت!

نووسەر و هونەرمەندی پیر پێویستە ئیتر لەمەودووا، زۆر موحتەرەمانە، بێ ئەوەی کەس پێی بڵێ، بۆ خۆی بچێت لە مۆزەخانەیەکدا هەڵکورمێت: باسی زەمانی دڵخۆشی «ئەحمەد حەسەن بەکر» بۆ نووسەر و هونەرمەندەکانی سەردەمی «مەلیک فەیصەڵ» بگێڕێتەوە...

دە، کەواتە، ئەی گەنجە نوێخوازە نۆزدە ساڵە - سی ساڵەییەکان!

ئەی بەهرە بێدارە دڕ و بەدەوەکان!

لەگەڵ هەموو ئەمانەش، بمبوورن، ئەگەر بە سەرکزی و خەفەتەوە، ئەمڕۆ، پێتان بڵێم: خۆزگە هێشتا چەند ڕۆژێکی دیکەش لەگەڵ ئێوەی گەنجدا بمایەتمەوە...

بەڕێز: ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان
بەڕێز: بنکەی چالاکی سەربازی و شارستانی هاوپەیمانان Cmoc

وەك ئاگادارن کۆماری ئیسلامی ئێران لەم ماوەیەدا کەوتە سەرکوتکردن و دامرکاندنەوەی داخوازی و ناڕەزایەتیەکانی قوتابیانی زانکۆکانی ئێران، لەو نێوەشدا سەرکوتی قوتابیانی کورد و دەستگیرکردنیان کەتا ئێستاش درێژەی هەیە، دیارە ئەمەش پێشێل کردنی پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤەو ناکۆکە بە بەندەکانی ڕێکەوتننامەی جنێف.

بۆیە ئێمە وەکو قوتابیانی زانکۆی سەلاحەددین کە لە خوارەوە ئیمزامان کردووە بە توندی ئیدانەی ئەم هەڵوێستە دەکەین و داوا دەکەین فشار بخەنە سەر کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ ئەوەی بە زووترین کات قوتابیە کوردەکان ئازاد بکرێن و گوێ لە ماف و داخوازییەکانیان بگیرێت...

ئیمزای کۆمەڵێك لە قوتابیانی
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر
٢٠٠٣/٧/٧

# تارماییەك بەڕێوەیە..

ڕێگە گرتن لە ڕێپێوانی ٢٠٠٢/١٢/٣١ لە زانکۆی صلاح الدین پاشان پەلامارو گرتن‌و ڕاوە دونانی قوتابیانی کۆلیژەکانی زانکۆی صلاح الدین تەنیا یەك ڕاستیمان بۆدەردەخەن ئەویش ئەوەیە دەسەڵات زۆر لەوە کلۆڵو داماو ترە کە بەوەفا بێت بەرامبەر بچوکترین دروشمەکانی خۆی لە ئاستی واقع دا . درۆیەکی گەورەی وەك دیموکراسی‌و ئازادی بیروڕا لە فەزای کوردی دا جگە لەموزەیەدەیەکی بێمانا‌و بێناوەرۆك کەرۆژانە لەلایەن دەسەڵاتەوە زۆر بەمنەتەوە دەدرێت بە ناوچەوانماندا هیچی تر نیە . ڕوداوی ١٢/٣١ دەبێت ئەوەمان فێربکات کە ( قوتابیان‌و خوێندکاران ) لەدەرەوەی گەمەی حیزب‌و ڕێکخراوە پاشکۆکانی‌دا ببن بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی چالاك کە سەرجەم کۆمەڵگاو گروپەکانی سەرسام بکات دڵنیاشین کە جگە لەم توێژە هیوای گۆران لە هیچ توێژێکی تر بەدی ناکرێت لەوەی ڕێگربێت بەرامبەر بەو بێحورمەتیانەی کە دەسەڵات بەرامبەر کۆمەڵگا دەینوێنێت . ڕێکخراوە قوتابی‌و خوێندکاریەکان جگەلە پۆلیسێکی بەنەمەکی حیزب‌و دەسەڵات بچوکترین داکۆکی کەر نین لە مافی خوێندکاربوونمان هەرلێرەوە ئێمە وەك کۆمەڵێك خوێندکاری زانکۆی سلێمانی کەمێك پرسمان هەیەکە ئەویش پرسی بێشوناسی‌مانەو بەشێك نین لەو دابەش بوونە حیزبی و ئیداریەی کە وڵاتیمێکی تاڵە هەروەها بێ هیوا بوینمانە لە وەی کە ڕێکخراوە پاشکۆکان بە وەزیفەی خۆیان هەڵناسن‌و نەبونیان باشترە لە بونیان و بچوکترین پرس‌و ڕامان پێناکرێت لەمەسەلە چارەنوسسازەکانی خۆماندا‌و ئەوەی خۆی بە نوێنەری ئێمە دەزانێت بچوکترین شەرعیەتی نوێنەرایەتی کردنی ئێمەیان نیە ئێمە لە هەر لایەکی ئەم وڵاتەدا بین دەبێت دەستکاری شتەکان بکەین و پشتگیری تەواوی خۆمان بۆ سەرجەم داواکاریەکانی قوتابیانی زانکۆی صلاح الدین دەردەبرین ئەمەش سەرەتاو ئاماژەیە بۆ لەدایك بوونی بزاف‌و گروپی ( قوتابی - خوێندکاری) ئازادو سەربەخۆ لەدەرەوەی هەیمەنەی حیزب‌و ڕێکخراوەکان دا بەڵکو تەنها هاو پیشەیی‌وهاو شوناسی‌و هاو خەمی کۆیان دەکاتەوە کاتی ئەوە هاتووە لەدەرەوەی گەمەکانی حیزب‌و ڕێکخراو پاشکۆکانی دا بیر لە خۆ ڕێکخستن بکرێتەوەو سەرجەم ڕێگاو ئامرازە شارستانیەکان بگرینە بەر هەر خۆشمان بەرپرسیارین لە هەڵوێست‌و دەر ئەنجامەکانی بۆیە ئێمە هیچمان نیە بیدۆڕێنین جگە لەو درۆ گەورانەی کە زیان لە دە ساڵە بەرهەمەکەی ئەوەیە کە دەیبینین..

*کۆمەڵێک خوێندکاری*

*زانکۆی سلێمانی*

*٢٠٠٣/١/٥ یەک شەممە*

## لەپێناو زانکۆیەکی ئازادو سیستەمێکی خوێندنی مۆدێرندا

**قوتابیانی هوشیارو خاوەن هەڵوێست..**

وەک هەمووتان ئاگادارن لەئەنجامی خۆپیشاندانی رۆژی 2002/12/28 سەرۆکی زانکۆی سەلاحەددین هەولێر بەوەکالەت ( بەرێز د. دارا میران) بەڵێنیداینێ کە داواکارییەکانمان بەزووترین کات جێبەجێ بکات. ئەمرۆش کە سێ رۆژ بەسەر ئەم بەڵێنەدا تێدەپەرێت، بێ ئەوەی کەمترین داخوازی جێبەجێ کرابێت وەک (دانی مەرماڵە)و باشترکردنی بارو گوزەرانی قوتابیانی دەرەوەی شار لەبەشە ناوخۆییەکاندا. کەچی دوای ئەم رێپێوانە بێحورمەتی بەقوتابییە خۆپیشاندەرەکان کراوە.

**قوتابیانی خاوەن ئیرادەو بازووی گۆڕان**

ئەم بارودۆخەی کە ئەمرۆ زانکۆکانی کوردستانی تێدایە سەرچاوەی دواخستنی کۆمەڵگای کوردی و ئاستی هوشیاری و مەعریفی قوتابیان لەلایەک و تاکی کوردی بەگشتی لەلایەکی دیکەیە. جگە لەوەی پرۆسەی بەمەدەنیکردن و دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگاکەمان دوادەخات. بۆیە ناکرێ چیتر لەم رەوشە بێدەنگ بین و چونکە ئەمە رەوشێکە لەبەرژەوەندی داهاتووی ئێمەدا نییە. ئەمەش وا لەئێمە دەخوازێت. وەک توێژێکی بەئاگاو بوێر، هەڵوێست و ئیرادەمان لەپێناو گۆڕینی ئەم رەوشە رێک بخەین.

**قوتابیانی خۆشەویست ..**

لەم رۆژدا هەموو لایەکتان بانگهێشت دەکەین. لەپێناو داکۆکی کردن لە مافە رەواکانی قوتابیان و بەرز راگرتنی زانکۆ وەک دەزگایەکی ئەکادیمی و مەعریفی و گێڕانەوەی حورمەت بۆ توێژی قوتابیان و بەهێزکردنی گەندەڵی ئیداری و مەعریفی و خوێندن لەنێو کایەی زانکۆدا.

لیژنەی ئامادەکاری خۆپیشاندانی
قوتابیانی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر
2002/12/31

# کتێبە چاپکراوەکانی دیکەی نووسەر

١- ماڵئاوا ئەی وڵاتەکەم. شانۆنامە. بڵاوکراوەی یەکیەتیی نووسەرانی کوردستان - شاخ: ١٩٨٤.
٢- بەیانی باش ئەی غەریبی. شانۆنامە. بنکەی یەکگرتن لە کۆپنهاگن: ١٩٨٨
٣- Exil شیعر. بڵاوکراوەی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، پاریس: ١٩٩٢

٤- ژمارەکانی گۆڤاری کوردستان (ئەستەمبۆل: ١٩١٩)، دەزگای گوڵان، هەولێر: ١٩٩٨.
٥- رۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەرەنسی، سەنتەری برایەتی، هەولێر: ١٩٩٨.
٦- سەرچاوەکانی کوردناسی، بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی: ١٩٩٨.

٧- زێری ناو زبڵ. تۆژینەوە و تێکستی وەرگێڕدراوی کوردۆلۆژی، دەزگای سەردەم، سلێمانی: ١٩٩٩ .
٨- ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، دهۆک: ١٩٩٩. (چاپی دووەم بە کرمانجیی ژووروو)
٩- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسەکاندا، بنکەی وێران، هەولێر: ١٩٩٩.
١٠- جوایەز، شیعر (بە هاوبەشی شاعیرانی دیکەی هەولێر)، دەزگای ئاراس: ١٩٩٩.
١١- سپیاتییەکانی ناو رەش، شیعر. بنکەی وێران، هەولێر: ١٩٩٩.
١٢-دراسات فی تاریخ الکورد. ترجمە: ترزە جاف، رابطە کاوا، بیروت: ١٩٩٩.

١٣- مەلا مەحموودی بایەزیدی، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٠
١٤- رۆژنامەی کوردستان(١٨٩٨)، بە هاوبەشی، بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی: ٢٠٠٠
١٥- پەتاتەخۆرەکان، کۆمەڵە چیرۆک، بڵاوکراوەی ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی، هەولێر: ٢٠٠٠. (چاپی دووەم: بنکەی گۆڤاری هاڤیبوون، بەرلین: ٢٠٠٢).

١٦- مێژووی شانۆ لە ئەدەبیاتی کوردیدا، دەزگای ئاراس: ٢٠٠١ .
١٧- مولازم تەحسین و شتی تریش، نۆڤلێت. بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی: ٢٠٠١ .
١٨- ژەنەراڵ شەریف پاشا، تۆژینەوەی مێژوویی، دەزگای سەردەم: ٢٠٠١ .
١٩- چۆلستان، وەرگێرانی کۆمەڵە چیرۆکی پەتاتەخۆرەکان بۆ رێنووسی لاتینی - کرمانجیی ژووروو، دەزگای ئاڤێستا، ئەستەمبۆل: ٢٠٠١
٢١- جوایەز (بەرهەمی هاوبەش لەگەڵ شاعیرانی دیکەی هەولێر)، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠١.

٢٢- عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، تۆژینەوەی ئەدەبی، دەزگای سپیریز، دهۆک: ٢٠٠٢

٢٣- مێژووی وەرگێڕان لە ئەدەبیاتی کوردیدا لە کۆنەوە تا ١٩٣٢، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، هەولێر: ٢٠٠٢

٢٤- سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا، ڕۆمان، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٢

٢٥- پیاوێکی شەپقەڕەشی پاڵتۆڕەشی پێڵاو شین، ڕۆمان، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٣.

٢٦- منداڵباز، ڕۆمان، بڵاوکردنەوەیماڵی شەرەفخانی بەتلیسی، هەولێر: ٢٠٠٣

٢٧- حەشیشەکێشەکان، شانۆنامە، بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر: ٢٠٠٣

٢٨- باوک، شانۆنامە، نووسینی ئۆگۆست ستریندبێرگ، و. لە فەرەنسییەوە، دەزگای ئاراس: ٢٠٠٤

٢٩- باخچەیەک شیعری فەرەنسی، لە فەرەنسییەوە، دەزگای سەردەم، سلێمانی: ٢٠٠٤

٣٠- ڕێبازە ئەدەبیەکان، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٤

٣١- چەند نامەیەکی فەرەنسی، سەنتەری ڕووناکبیریی هەتاو، چاپی یەکەم، هەولێر: ٢٠٠٥ (چاپی دووەم: سێپتەمبەری ٢٠٠٥)

٣٢- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسە ئەورووپییەکاندا، وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر: ٢٠٠٥

٣٣- مێژووی هونەری شێوەکاری لە کوردستاندا، دەزگای سپیریز، دهۆک: ٢٠٠٥

